یۆستاین گاردەر

# سڵاو... کەس لێرەیە؟

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:
ئـــارام ئەمین شوانی

هەولێر – ٢٠١١



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- سڵاو... کەس لێرەیە؟
- **نووسینی**: یۆستاین گاردەر
- وەرگێڕ لە عەرەبییەوە بۆ کوردی: ئارام ئەمین شوانی
- نەخشەسازی ناوەوە: هاوڕێ ساڵح
- بەرگ: مراد بەهرامیان
- ژمارەی سپاردن: (٩٥٣) لە ساڵی ٢٠١١
- نرخ: ١٥٠٠ دینار
- چاپ: یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی رۆژهەڵات (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٥٠٧)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ئاسمان

**ئازیزەکەم کامێلا،**

کاتێك لە پشوی خوێندنی نیوەی ساڵ تۆمان لەگەڵ بووی، پەیمانم پێدای چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە، ئەوە ئێستا بۆ پەیمانەکەم بە ئەمەکم:

بە هۆی هۆکارێکی تایبەتیەوە ئەمرۆم هەڵبژارد تا بۆت بنوسم، چونکە جەژنی لە دایك بوونت نزیك بووەتەوە، ئیدی دەگەی بە هەمان ئەو تەمەنەی من، کاتێك چاوەڕوانی لە دایك بوونی برا بچکۆڵەکەم بووم، ئیتر پێم باش بوو باسی (میکا)ت بۆ بکەم ، تا باسکردنەکەم زانیاریت پتر بکات لە بارەی ئەم جیهانەی تیایدا دەژین. ئەو ساتانەت لە یادە پێکەوە تێمان پەڕاندن؟ .. ئایا لە یادتە لەو کەنارەی بەلەمەکەمان لێی بەستبووەوە راوە قرژاڵمان دەکرد؟ ئەوەت لەیادە بە تەلەسکۆب تەماشای ئەستێرەکانمان دەکرد؟ لە بیرتە لەو شەوەی پیتزامان دروست دەکرد هەور ئەستێرەکانی داپۆشیبوو؟ من زۆر جار ئەو هەفتەیەم بە یاد دێتەوە کە پێکەوە بەڕێمان کرد. کاتێکی زۆر خۆش بوو! وێڕای ئەوەی ماوەیەکی زۆر تێپەڕ بووە، بەڵام زۆر شتم لە بارەی (میکا)وە لە یاد ماوە. ناڵێم هەموو شتەکانم لە بیرە وەکو ئەوەی دوێنێ روویاندابێ، بەڵام وەکو ئەوەی هەفتەیەکە روویان دابێ. بۆیە دەشێ هەندێکیانم لە یاد چوبێ. یا هەندێ ووردەکاری دیکەم بۆ زیاد کردبێ، بەڵام هەمیشە شتی وا رووەدات کاتێك دەمانەوێ وەسفی رووداوێك بکەین کە ماوەیەکی درێژە روویداوە. تا ئێستاش سەرەتای رووداوەکەم زۆر بە روونی لە بیرە دەتوانم بڵێم سەرەتاکەی زۆر ئاسایی و سادە بوو. ئەوە ئەگەر وای دابنێین چاوەڕوانی لە دایك بوونی برا یا خوشك شتێکی ئاسایی بێت. من خۆم بە شتێکی ئاسایی نازانم. ئەو شتانەی دەوروبەرمان هەمیشە شت گەلی ئاسایی نین وەکو ئەوەی پێمان وایە. ئەو رۆژانە، هەندێ مریشکمان بە خێو دەکرد کە هەمیشە لە ناو باخچەکە خەریکی چینە



کردن بوون. ئایا پێت وایە مریشك شتێکی سادە و ئاساییە؟ منیش بەر لەوەی چاوم بە (مێکا)بکەوێ پێم شتێکی ئاسایی بوو.بێنە پێش چاوی خۆت تۆ کەشتیوانی بۆشاییت و ساڵانێکی زۆر بێت لە ئاسمانی دەرەوە لە گەڕاندا بیت، ئایا خۆت بە بەختەوەر نازانی ئەگەر لەو ماوە درێژەدا تەنیا یەك مریشك ببینی؟

لە ئاسمانی فراوانی دەرەوەدا کە ئێمە پێی دەڵێن گەردوون، ملیۆنان ئەستێرە هەن، کەمێك لەو ئەستێرانە هەسارەیەك یا دوو هەسارە یا زیاتریان هەیە، لە ریرەوێك بە دەوری ئەستێرەکەدا دەخولێنەوە و پێی دەوترێت خولگە.

دوای ئەوەی سەدان ساڵ و بگرە هەزاران ساڵ گەشت دەکەین، ئینجا دەگەینە سەر هەسارەیەك کە جۆرێك ژیانی تێدایە. تەنانەت ئەگەر ژیانیشی تێدا هەبێ، بەڵام ئەگەری ئەوەی لەو هەسارەیە مریشك بدۆزینەوە ئەگەرێکی زۆر دوورە. پێم وانییە هەرگیز شتی وەها روو بدات.

پێم وانییە مریشك لە هیچ کوێیەکی دیکەی ئەم گەردوونە هەبێت. کەواتە ناکرێ مریشك بە شتێکی ئاسای لە قەڵەم بدەین.

هەر بە بۆنەی قسەکردنمان لەسەر مریشك، ئایا دەزانی مریشك تاقە باڵندەیە دەتوانێ هەموو رۆژێك هێلکەیەك بکات؟ ئایا بیستوتە باڵندەیەکی دیکە بتوانێ شتی وەها بکات؟

بۆیە بەم قسەیە چیرۆکەکەم دەست پێکرد، چونکە (میکا) فێری کردم لەم ژیانەدا هیچ شتێك نییە ئاسایی بێت. چونکە لە ژیاندا هیچ رۆژێك نییە لەویتر بچێت. ئێمە نازانین دوای ئەمرۆ چەند رۆژی تر دێت. کەوایە چۆن رۆژێکی ئاساییە؟.

قسەیەکی تر کە زۆر نابەجێییە لەو قسەیەی دەڵێ (مریشك ئاساییە) یا رۆژی ئاسایی، قسە کردنە لەسەر( کوری ئاسایی) یا (کچی ئاسایی). ئەمە قسەیەکە کاتێك بە کاری دەهێنین کە هەوڵ نادەین خەڵکی بناسین و حەقیقەتیان تێ بگەین.

ئەو کات من چاوەڕوانی ئەوەبووم برا یا خوشکێکم لەدایك ببێ. ئەندامانی خێزانەکەم هەمیشە دەیان پرسی: ئایا کۆرپەکە کچ دەبێت یا کوڕ؟ من دڵنیا بووم ئەو

شتەی لە سکی دایکم دایە کوڕ دەبێت، نازانم بۆچی تا ئەو رادەیە دڵنیا بووم. رەنگە لەبەر ئەوە بوو بێت کە بە هیوای ئەوە بووم برایەکی بچوکم هەبێت.

ئێمەی مرۆڤ هەمیشە بڕوامان بەوەیە کە خۆمان دەمانەوێ. ئەستەم بوو بۆ من خەیاڵی ژیانێك بکەم لە گەڵ برایەکی بچوکدا. بەڵام لایەنی کەم دەمزانی ئەگەر کەمێکیش بێت لە من دەچێ. بەڵام خوشك زۆر ئەستەم بوو خەیاڵ بکەم چۆن دەبێ.

دایکم پێ ووتم مناڵەکە لە سکیدا سەرەو خوار پاڵ کەوتووە. هەروەها تا دایکم ماندوو دەکا (لە ناوسکی) شەق لە دایکم دەدا، بە خۆمم ووت: ئەم برا بچوکەی من پێویستی بەوەیە فێری بکەم چۆن بە ئەدەب بێت. بیرم لەوە کردەوە ئامۆژگاری بکەم چیتر دایکم ماندوو نەکات، ئەوەشم بە بیردا هات ئەم برا بچوکەی من لە ژیانی دواتریدا پێویستی زۆری بە ئامۆژگاری و رێنمایی هەیە.

ئێمە کە دێینە ئەم جیهانەوە، هیچ لە بارەی شێوازی رەفتار کردنەوە نازانین، چەندین ساڵی دەوێ تا فێر دەبین کە چۆن رێزی خەڵکی تر بگرین و رەچاوی هەست و سۆزیان بکەین.

بیرم کردەوە برا بچوکەکەم دێتە ناو جیهانێکەوە تەواو پێی نامۆیە. هیچی لە بارەوە نازانێ. لە بارو دۆخێکدایە کە هەرگیز ئێرەی پێدا نابەم . کاتێك دێتە ناو ئەم جیهانەوە هەر دەبێ لەسەر هەندێ شت رابێت. ئەو هیچ لە بارەی ئەو شتانەوە نازانێ کە دەکەونە دەرەوەی ئەو شوێنە تاریکەی ئیستا تێدایە. من زۆر بە گرنگیەوە بیرم دەکردەوە ، چۆن باسی ئەو شتانەی بۆ بکەم کە لەم جیهانەدا لە دەورو بەریدان. ئەم برا بچوکەم پێشتر نەهاتۆتە ئەم جیهانەوە. خۆر و ئەستێرە ناناسێ. گوڵ و ئاژەڵی نەبینیوە. تەنانەت ناوی ئەو شتانەش نازانێ.

دەبێ خۆم فێری زۆرێك لەو شتانەی بکەم کە نایانزانم بۆ ئەوەی ئەویش فێر بکەم. بۆ نموونە من نەمدەزانی جیاوازی نیوان پڵنگ و پڵنگی پەڵاوی چییە. هەڵبەت دەزانم پێستی هەردوو کیان پەڵە پەڵەیە، بەڵام شێوەی پەڵەی سەر پێستی پڵنگ جیاوازە لە پەڵەی پێستی پڵنگی پەڵاوی.

گرفتەکە ئەوەیە لەسەر ئەم هەسارەیە هەزاران جۆری ئاژەڵ هەیە کە دەبێ زۆر شت لە بارەیانەوە فێر بین. من پێم وایە دەبێ کاتێکی زۆر تەرخان بکەم تا برا بچوکەکەم فێر



بکەم جیاوازی بکات لە نێوان سەگ و پشیلەدا. مرۆڤ هەزاران ساڵی تێپەراندووە ئینجا بۆ هەر ئاژەڵ و رووەکێك ناوێکی داناوە و کەچی هێشتاش تەواو نەبووە. پێم وایە مرۆڤ ناتوانێ لە ژیانی کورتی خۆیدا هەموو شتێك فێر ببێ.

کاتێك تەمەنم هەشت ساڵان بوو ئەم رووداوە روویدا، شەو بوو نوستبووم، خەوم دەبینی، باوکم خەبەری کردمەوە.

ووتی: هەستە (چو) کۆرپەکە خەریکە دێتە دەرەوە.

دەست بە جێ هەستامەوە و وتم:"نابێ ئێستا بێتە دەرەوە، وا نیوە شەوە، پورە هێلینیش هێشتا نەهاتووە".

باوکم ووتی: "هەندێ مناڵ بریار دەدەن لەم کاتەدا بێنە دەرەوە، ئەوان نازانن شەو و رۆژ چییە، پەیوەندیم بە پورە هێلینەوە کرد و ئێستا دێ، ئیدی دەبێ بە تەنیا چاوەڕێ بکەی، بە داخەوە، چونکە ئێستا دایکت دەبەم بۆ نەخۆشخانە".

دایکم و باوکم لە گەڵ پورە هێلین رێککەوتیبوون کاتی نزیکبوونەوەی لەدایکبوونی مناڵەکە، پورە هێلین بێت بۆ ماڵمان تا ئاگای لە من بێت. بەڵام ئەو کات هێشتا هەفتەیەکی مابوو.

کامێلای ئازیز ئێستا ژیان گۆڕاوە لە چاو ئەو کاتەی مناڵێك بووم لە تەمەنی تۆدا. دایکەکانی ئێستا مناڵەکانیان لە گەڵ خۆیان دەبەن بۆ نەخۆشخانە، بەڵام ئەو کات کاتێك دایك و باوك لە ماڵەوە دەردەچون دەبوایە مناڵ لە ماڵەوە بمێنێتەوە. بۆیە لەوەی بە تەنیا لە ماڵ مامەوە بێزار نەبووم، چونکە شتێکبوو لەسەر راهاتبووم.

بە باوکمم وت: " باش دەبم، تا پورە هێلین دێ بە تەتکەکانم یاری دەکەم".

ئەو سەردەمە میکانۆی(*) تایبەتمان نەدەکڕی بۆ دروستکردنی موشەك. بەڵکو بە خەیاڵی خۆم موشەکم دروست دەکرد. ئەوەی دەمویست بیرم لێ دەکردەوە ئینجا بە میکانۆکان جێ بەجێیانم دەکرد.

(*) میکانۆ: پارچە یاریی منالآنە خانوو و فرۆکە و ...تاد، پێ دروست دەکرێ.

ئینجا هەر بە پەلە جلەکانم لە بەر کرد، زۆر بە پەرۆشبووم بۆ هاتنی برا بچوکەکەم. ئێستا چیتر دایکم ئازار نادات. هەر وەك من بۆ ماوەی هەفتەیەك نەمدەتوانی لە ژوورەکەی دایکم دابنیشم. بەرەو پەنچەرەکە رۆیشتم تا پەردەکە لا ببەم، بەرەو سەرەوە لولم کرد، ووردە ووردە بە دەوری خۆیدا لولی خوارد. ئینجا تەماشای ئاسمانم کرد کە بە ئەستێرە رازابۆوە. بە رادەیەك بێگەرد بوو کە پێشتر وا بەبێگەردی نەم بینیبوو.

چومە نهۆمی خوارەوە، دایکم لەسەر کورسیەکی کۆڵەکەدار دانیشتبوو، دەستی بە پشتیەوە گرتبوو، چاوانی داخستبوو و روخساریشی بە هۆی ئازارەوە گرژ بوو بووە.

ویستم پێی بڵێم ئەستەمە بۆ مرۆڤ برایەکی بچوکی هەبێ، بەڵام ئەم قسەیەم بۆ کاتێکی تر دواخست، تا بێزاری نەکەم، چونکە باوکم پێی وتبووم لە دایکبوونی مناڵ کارێکی زۆر سەخت و بەئازارە.

دایکم وباوکم ماڵیان بەجێ هێشت، رووناکی ئۆتۆمبێلەکەش دوور کەوتەوە، شەو زۆر تاریك و نوتەك بوو. بەڵام ئەوەی زۆر وەڕەسی دەکردم ئەوەبوو ئەوان سەرقاڵیان کردم بە بیرکردنەوە لەو مناڵە بچوکەی کە خەریکبوو لە سکی دایکمەوە دەهاتە دەرەوە ماوەیەکی درێژ. لەسەر دەرگاکە وەستام، ئینجا چومە ماڵەوە و لە دوای خۆمەوە دەرگاکەم داخست، ماڵ زۆر کپ و بێ دەنگ بوو، لەوە دەچو چۆڵ کرابێ، هەروەك ئاسمانی دەرەوە.



# باخچە

گەرامەوە بۆ ژوورەکەم و لەسەر کورسیەك بەرامبەر بە پەنچەرەکە دانیشتم، تاوێکی باش لەوێ دانیشتم: لە ئەستێرەکان رامام، لە دڵی خۆمدا ووتم دەبێ لەسەر ئەستێرەیەکی تر ژیان هەبێت، یا زەویەکەی ئێمە تاکە هەسارەیە لەم گەردوونە بەرینەدا ژیانی لەسەر هەبێت.

هەستم بە نیگەرانی کرد لەوەی بە تەنها لە ماڵەوە بووم.

هەر دانیشتبووم، ووردە ووردە تاریکی دەرەوییەوە، روناکیش دەکشاو رەنگی ئاسمان لە رەنگی شینی کاڵباوەوە دەگۆڕا بە شینێکی تاریك. هەمووشتەکانی دەرورو بەرم کپ وخامۆش بوون. گوێم لە دەنگی شەپۆڵەکان بوو خۆیان دەکێشا بە کەناری کەنداوە بچوکەکەدا کە بەلەمەکەمان تێدا بەستبۆوە.

لە پڕ کڵپەیەکی درەوشاوە لە ئاسمانەوە لە نزیك منەوە دارشا، وەك ئەوەی دابەزێتە ناو باخچەکەمان، پێشتر بیستبووم هەرکات مناڵێك لە دایك ببێ ئەستێرەیەك دادەڕشێ. رەنگە ئەم ئەستێرە دارشانەش بە بۆنەی لە دایك بوونی برا بچکۆڵەکەمەوە بێت. نازانم دوای ئەوە چی روویدا، بەڵام دەنگێکم گوێ لێ بوو لە باخچەکەوە دەهات، بۆ ساتێك پێم وا بوو دایکم و باوکم لە نەخۆشخانە گەڕاونەتەوە و برا بچوکەڵەکەشمیان لەگەڵدایە، خۆم بەسەر لێواری پەنچەرەکەیا دادا تا بزانم وایە. بەڵام کوریژکەیەکی بچکۆڵەم بینی بە سەر درەختی سێوەکەدا شۆڕبۆتەوە. ئەو مناڵەش (میکا) بوو.

دواتر زانیم (میکا) بەختەوەر بووە، یەکەم: چونکە کەوتبووە سەر درەختی سێوەکە، دووەم: چونکە شەرواڵەکەی بە چڵی درەختەکەوە گیر بووبوو. ئیدی هەر بە هەڵواسراوی مابووەوە. واتە سەر بەرەوخوار بوو. ئەگەر بکەوتبایەتە ناو ئەو حەوزە گوڵەی کە دایکم چاندبووی، ئەوە زۆر بەسەختی بریندار دەبوو. بەپەلە بە پلیکانەکەدا هاتمە خوارەوە و بۆناو باخچەکە چوم، بەرەو لای ئەو مناڵەی بە درەختەکەدا هەڵواسرابوو.

" بێ گومان خەون دەبینم"، ئەوە یەکەم  ووشە بوو وتی، زۆر لەوە سەرسام بووم، چونکە من دڵنیا بووم لەوەی بێدارم.

کامێلا، ئەو مناڵە نە لە من دەچو نە لە تۆ. لە چاو و دەم گوێچکەی دیار بوو لە شوێنێکی دیکەوە هاتبوو، ئەو کات نەم دەزانی لە کەشتیەکی ئاسمانیەوە کەوتووە. بەلاّم هیچ سەراسیمە نەبووم لەوەی بە زمانی من قسەی دەکرد. وەختێك مناڵێکی راستەقینە لە ئاسمانەوە بەردەبێتەوە، ئەوەت بەلاوە گرنگ نی یە بە چ زمانێك قسان دەکات، ئەوەم پێ سەیر بوو دەتوانێت قسە بکات. مناڵەکە جارێکی تر ووتی: " بیگومان خەون دەبینم".

پرسیارەکان مێشکمیان جەنجاڵ کردبوو: " ئەم مناڵە کێ یە لەسەر ئەم درەختە؟ .. ئەگەر ئەمە خەونە، ئایا ئەو خەون دەبینێ یا من؟ ئەگەر ئەو خەون دەبینێ، ئەی  چۆن دەبێ هاوکات من بێدار بم؟".

هەر بە درختەکەوە هەڵواسرابوو بە هێواشی بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە. منیش لەگەڵێدا سەرم دەسورا، نەمدەزانی چی پێ بڵێم .ئەوەم بە بیر هاتەوە لە ژوورەکەمدا تەنها بووم ولە ئەستێرەکان راما بووم، بۆیە هەستم بە نیگەرانی کرد، هیواداربووم بە تەنها لە ماڵەوەدا نەبوایام، دوای ساتێك مناڵێکم بینی بە درەختێکی سێوەوە لە بەرامبەرم گیری خواردووە.

ئایا سەیر نییە هیواکەم لە پڕ بەدی هات؟ بە دەگمەن هیواکان بەو خێراییە بەدی دێن. مناڵەکە لێی پرسیم: تۆ کێی؟ وتم :" ناوم چوە"، ووتی: "منیش میکام، بۆ چی بەم شێوەیە سەرو ژێر وەستاوی؟ پێکەنیم، ئەو بە پەلە پەنجەی نایە دەمی، رەنگە هەستی بە شەرم کردبێ کەمن پێکەنیم. ووتم : "تۆی بە سەراو ژێری وەستاوی".

میکا دەستی لە دەمی دەرکرد، و پەنجەکانی بلاّوکردەوە و لە ئاسمان دەی جولاّند. ووتی: "کاتێك دوو کەس بەیەك دەگەن، یەکێکیان سەرەو ژێرە، ئاسان نییە بزانی کامیان سەرو ژێرەو و کامیان لەسەرپێ یە". وەلاّمەکەی حەپەساندمی، نەم زانی چی بڵێم.

میکا ئاماژەی بۆ زەوی کرد و ووتی" بەهەرحاڵ، خۆزگە میهرەبانیت دەنواند و یارمەتیت دەدام سەرکەومە سەر ئەم زەویە".



ووتم: "مەبەستت دابەزینە"؟

ووتی: "نا سەرکەوتن".

بەرەو گۆگای کەل و پەلەکان رام کرد، چوم مەقەسێکم هێنا کە دایکم بۆ بن پەلکردنی گوڵەکان بەکاری دەهێنا، هەروەها سندوقێکی کۆنم هێنا و لە ژێر درەختەکە دامنا تا بچمە سەری، ئینجا (میکا)م لە لقی درەختەکە رزگار کرد.

میکا دابەزیە سەر زەوی،  هەر لەسەر سەر وەستا بوو، تا ئێستا ئەو حەپەسان و سەراسیمیەم لە یادە بە هۆی ئەوەی لەسەر سەر وەستا بوو بە بێ ئەوەی دەستەکانی بەکاربهێنێ، ئینجا چاوی گێڕا، لە شتەکانی دەوروبەری خۆی رادەما، وەك ئەوەی شوێنەکە بپشکنێ، ئینجا سەرنجی خستە ئاسمانی سەرەوەی. لەو کاتەدا قاچەکانی دابەزاندە سەر زەوی و تاوێك لەسەر ئەژنۆ وەستا، پاشان کەوتە سەر پێ و بە پەشۆکاویەوە تەماشای دەورو بەری خۆی دەکرد. بوێریم کرد و پرسیم"لە کوێوە هاتوویت"؟

ووتی: "لە کەشتیەکی ئاسمانیەوە هاتووم، بینیم لە هەسارەیەك نزیك بوومەتەوە کە ژیانی لەسەرە، ئیدی دەلاقەیەکم کردەوە و تا تەماشای هەسارەکە بکەم، دەست بەجێ کەوتم".

ئینجا ئاماژەی بە گژو گیاکانی سەر زەوی کرد، ووتی: "پێم وابوو ئێرە سەرەوەیە "پاشان ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد و ووتی: " ئەوێش خوارەوەیە".

دیسان پەنجەکانی لە هەوادا دەبزواند، ووتی : "من دڵنیا بووم کە هەسارەیەکم بەجێ هێشت بەرەو سەرەوە هاتم، تاکو سەرم کێشای بە هەسارەکەتاندا". ئینجا ئاماژەی بە مانگ کرد و ووتی :" سەرنجمدا هەسارەکەتان مانگێکی هەیە، کاتێك دەچن بۆ سەر مانگ، ئایا دەچن بۆ سەرەوە یا بۆ خوارەوە؟".

**وتم:** "بۆ سەرەوە"، لەوەی وتیشم دڵنیابووم، یەکەم مرۆڤ کە لەسەر رووی مانگ نیشتەوە چەند هەفتەیەك لەوەوبەر بوو.

میکا جارێکی تر پەنجەی لەدەمی نایەوە، ئینجا کە ویستی پرسیارێکی تر بکات پەنجەی لەدەمی دەرکرد و **وتی:** "کاتێك لەسەر رووی مانگ دادەبەزن، ئایا دانابەزنە خوارەوە؟".

بەر لەوەی وەڵام بدەمەوە جوان بیرمکردەوە، ئینجا سەرم لەقاند و وتم: "بەڵێ"، وتی: "کاتێك لەوێ دەبن، گەر بتانەوێ تەماشای زەوی بکەن ئایا تەماشای سەرەوە ناکەن؟".

نەچومەتە سەر مانگ، بەڵام تەماشای هەموو ئەو بەرنامە تەلەفزیۆنیانەم کردبوو کە لەبارەی یەکەم نیشتنەوەی مرۆڤ لەسەر مانگ ئامادەکرابوون، ئینجا وتم: "بەڵێ".

وتی: "کەوایە دەبێ لە مابەینی زەوی و مانگدا شوێنێك هەبێ سەرەوە ببێتە خوارەوە و خوارەوە ببێتە سەرەوە".

لەوەی وتی بیرم کردەوە، دیتم قسەیەکی ماقوڵە، ئینجا وتم: "بەڵێ وای دەبینم".

کەمێك بیری کردەوە و وتی: "پێم وایە بە دروستی ئەو خاڵە دەزانم کە ئەو گۆڕانەی تێدا روودەدا".

لە پڕ، میکا لە ناو باخچەکە وەك کەنگەر کەوتە هەڵبەز و دابەز، لەسەرەتادا وردە هەڵبەزی ورییایانە، ئینجا بەهەموو هێزی خۆی کەوتە قەڵەمباز.

پاشان ووتی: "پێدەچێ هەسارەکەی ئێوە لە هەسارەکەی ئێمە بچوکتربێ، هێزی کێشکردنەکەشی لە هێزی کێشکردنی هەسارەکەی ئێمە لاوازترە".

بە حەپەسانەوە تەماشام کرد، وتی:" نازانی هێزی کێشکردن چییە؟ هێزێکی نەبینراوە، ئەو هێزە تۆ و هەموو شتەکانی تر بەرەو سەر زەوی کێش دەکا، ئەگەر هێزی کێشکردن نەبێت، شتەکان دەکەون و بە ئاسماندا بلاو دەبنەوە".

درێژەی بە شیکردنەوەکەی دا و ووتی: "لەسەر هەسارەکەی تۆ دەتوانم دوو هێندەی سەر هەسارەکەی خۆم باز بدەم، چونکە هێزی کێشکردن لێرە لە هێزی کێشکردنی ئەوێ لاوازترە، ئەگەر تۆ لەگەڵم بێی بۆ هەسارەکەی من، ناتوانی یەك جاریش باز بدەی".

هەستم بە جۆرێك لە ستەم کرد، ئەو دەتوانێ زۆر لەمن زیاتر باز بدات، تەنیا لەبەر ئەوەی لە هەسارەیەکەوە هاتووە هێزی کێشکردنەکەی لە هێزی کێشکردنی هەسارەکەی من بەهێز ترە.

بەڵام ئەمە وای لێکردم بیر بکەمەوە، بیرم کردەوە، ئەو پیاوەی لەسەر رووی مانگ نیشتەوە، بازی بڵندی وای دەدا کە نەیدەتوانی لەسەر زەوی ئەو جۆرە بازدانە بکات،



وێرای پۆشاکە بۆشاییە قورسەکەی. کەوایە بێگومان هێزی کێشکردنی مانگ لە هێزی کێشکردنی زەوی لاوازترە، زۆریش لە هێزی کێشکردنی هەسارەکەی میکا لاوازترە.

دوای ئەوەی میکا لە تاقیکردنەوەی هێزی کێشکردن تەواوبوو، کەوتە سەر دەست و پێ و گژ و گیاکانی دەپشکنێ، سەرەتا بۆنی کردن، ئینجا دوو تاڵی گژ و گیای لێکردەوە و خستیە دەمیەوە، پاشان یەکسەر خواردنی.

پێم وت: "گژ و گیا مەخۆ، تامی ناخۆشە".

میکا هەر خرمە خرمی بوو و ئەوەی لەدەمیدابوو دەیکرۆشت، تا زۆرم دڵ بۆ حاڵی ئێشا، لەسەر هەسارەیەکی زۆر دوورەوە هاتووە، بێگومان برسیەتی، بەرەو لای درەختی سێوەکە رامکرد و سێوێکم لەسەر زەوی هەڵگرتەوە و پێشکەشم کرد، هەستم کرد نوێنەرایەتی هەموو دانیشتوانی سەر زەوی دەکەم و دەبێ ئەم میوانە بێگانەیە میوانداری بکەم.

پێم وت: "ئەم سێوە بخۆ".

میکا تەماشای سێوەکەی کرد وەك ئەوەی یەکەمجاری بێت سێو ببینێ، ئینجا بۆنی کرد، پاشان پارچەیەکی بچوکی تام کرد و وتی: "زۆر بەتامە"، ئینجا قەپاڵێکی گەورەی لێدا.

لێم پرسی: "تامیت پێ خۆشە"، زۆر بە توندی لەبەرامبەرم چەمیەوە.

زۆر پەرۆشی ئەوەبووم بزانم هەستی ئەو کەسە چۆنە کە بۆ یەکەمجار تامی سێو دەکات.

دیسانەوە لێم پرسی :"تامی چۆنە بەلاتەوە؟" دووبارە چەمیەوە.

لێم پرسی: "بۆچی بەو شێوەیە دەچەمیەوە؟".

ووتی:"لەو شوێنەی لێوەی هاتووم، کاتێك یەکێك پرسیارێکی سەرنجراکێش دەکات، بۆی دەچەمینەوە، پرسیارەکە هەرچەند قوڵ بێت، چەمینەوەکە زیاتر دەبێت".

هەستم کرد پڕوپوچترین بیرۆکەیە لە ژیانمدا بیستبێتم. نەمزانی چۆن پرسیارێك تا رادەی بۆ چەمینەوە گرنگە، چۆن پرسیار شایانی چەمینەوەیە؟".

پرسیم: "کاتێك یەکتر دەبینن چۆن سڵاو لە یەکتر دەکەن؟".

وتی: "بیر لە پرسیارێکی سەرنجراکێش دەکەینەوە".

وتم: "بۆ؟". ئەمە پرسیاربوو، زۆر بە پەلە لەبەرامبەر چەمییەوە و ووتی: "بیر لە پرسیاری قوڵ و زیرەکانە دەکەینەوە و ئینجا پرسیارەکە دەکەین و ئەویش تری بۆمان دەچەمێتەوە".

ئەم وەڵامەم پێ سەرنجڕاکێش بوو، زۆر بە توندی بۆی چەمیمەوە، کاتێك سەرم بەرز کردەوە، بینیم سەرلەنوێ میکا دەستی خستوەتەوە دەمی، وەکو ئەوەی هەستیم بریندار کردبێ، ئینجا دەستی لە دەمی دەرکرد و لێی پرسیم: "بۆچی چەمیتەوە؟".

وتم: "چونکە وەڵامێکی زۆر زیرەکانەت دایەوە".

وتی: "بەڵام وەڵام هەرگیز شایانی چەمینەوە نییە، ئیتر چەند گرنگ و زیرەکانەش بێت، پێویست ناکا بۆی بچەمینەوە".

سەری رەزامەندیم بۆی لەقاند، دەستبەجێ پەشیمان بوومەوە، ترسام میکا سەرلەقاندن بە ئاماژەی چەمینەوەی وەڵامەکەی تێ بگات، بەڵام ئەو درێژەی بە قسەکانیدا.

ووتی: "چەمینەوەکەی تۆ واتە چەمینەوە بۆ ئەو کەسەی بەرامبەرت، تا ئەو پێشت بکەوێ، بۆیە وەڵامی هیچ پرسیارێك پێویستی بە چەمینەوە نییە".

وتم: "بۆچی؟".

ووتی: "چونکە وەڵام گوزارشتە لەو رێگایەی دەکەوێتە دواتەوە، بەڵام پرسیار ئاماژەیە بەو رێگەیەی دەکەوێتە پێشتەوە، گوزارشتە لەو رێگەیەی کە دێ".

وشەکانی لەوپەڕی داناییدا بوون، بەڵام رێگەم بەخۆم نەدا بۆی بچەمێمەوە.

لەو ساتەدا خۆر هەڵات، کە واتای سەرەتای رۆژێکی نوێ بوو.

میکا جلەکانی راکێشام و ئاماژەی بەزەردەی ئاسۆ کرد و وتی: "ناوی ئەو ئەستێرەیە چییە؟".

وتم: "ئەوە خۆرە".



میکا پەنجەکانی لێك بڵاو کردەوە و دەیجوڵاند و وتی: "بەهەر حاڵ ئەمە ئەستێرەیە، هەموو خۆرەکان ئەستێرەن، هەموو ئەستێرەکانیش خۆرن، هەموو هەسارەیەك مانگی نییە بە دەوریدا بسوڕێتەوە، ئەگەر ژیان لەسەر ئەو هەسارەیە نەبێت کە تەماشای مانگەکەی دەکات، ئەوە بەو هەسارەیە ناوترێ خۆر".

قسەکانی راست بوون، منیش ویستم وەکو ئەو قسەیەکی بەجێ بکەم.

وتم: "بێگومان هەسارەکان هەست بە تەنیایی دەکەن ئەگەر ئەستێرەیەکیان نەبێ بۆیان هەڵبێ و کەسێك نەبێ تەماشای بکات وەکو ئەوەی ئێمە تەماشای خۆرەکەی خۆمان دەکەین کاتێك لە رۆژێکی نوێدا هەڵدێ".

میکا ووتی: "تۆ دەتوانی تەماشای بکەی"، وتم: "من؟".

وتی: "بێگومان، تۆ دەتوانی تەماشای ئەستێرە تەنیاکان بکەی کاتێك سەر لەنوێ لە شەواندا دەردەکەونەوە، هەرچەندێك شەویش تاریك و نوتەك بێ، ئەوە لە ئاسماندا خۆری زۆرتر دەبینین، چونکە لە رۆژدا تەنیا خۆرەکەی خۆمان دەبینین".

ئەوە یەکەم یەکتر بینینمانبوو لەگەڵ میکادا.

کاتێك بە قوڵی بیری دەکردەوە پەنجەی دەخستە دەمی و ئینجا پەنجەکانی ئاوەڵا دەکرد و هەڵی دەسوڕاند ئەگەر بیویستایە بیرۆکەیەکی نوێ شی بکاتەوە.

هەر کاتێکیش پرسیارێکی جیاوازم بکردایە، بە توندی دەچەمیەوە، کاتێکیش وەڵامی پرسیارەکەم دەدایەوە بە پەرۆشەوە گوێی دەگرت تا پرسیارێکی تازە بکات.

تا دوای پەیوەندییە تەلەفۆنییەکە نەمدەزانی تورە و کەللەیش دەبێ.

# ماڵ

گوێم لە زەنگی تەلەفۆن بوو، میکاش بیستی، سەری خۆی جولاند، پەنجەشی گوێچکەیەوە جولاند، ئینجا قیژاندی: "دەنگێکی زۆر جارسکەر لە گوێچکەمدایە".

پێکەنیم و وتم: "مەترسە، ئەوە تەلەفۆنە".

بەڵام قسەکەم زیاتر تۆقاندی، وتی: "ئایا مەترسیدار نییە زەنگی تەلەفۆن بە گوێچکەتدا بێت؟".

وتم: "ئەوە لە گوێچکەی تۆدا نییە"، دەستبەجێ چوم بۆ دالانی ماڵەوە، میکاش بە پەلە لەدوامەوە خۆی کرد بە ژوورا.

باوکم لەسەر خەت بوو، وتی: "سلاو چو، ئێمە تا ئێستا لە نەخۆشخانەین، باشین، بەڵام مناڵەکە هێشتا دەرنەچوە، دەشێ چەند کاتژمێرێکی دیکەی پێ بچێ، تۆ سەلامەتی؟ پورە هێلین هات؟".

وتم: "هێشتا نەگەیشتووە، بەڵام من باشم، نیگەران مەبە".

لەو ساتەدا میکا چوە چێشتخانەکەوە، پاشان چوە سەر کورسییەك و دەستی درێژکرد بۆ دۆڵابی خواردنەکە.

باوکم بە نیگەرانییەوە وتی: "ئەوە چییە خشپەی دێ؟".

میکا دەرگایەکی سەرەوەی دۆڵابەکەی کردەوە.

باوکم ووتی: "چو تۆ بەراستی سەلامەتی؟".

لەو کاتیدا کیسە ئاردێك لە دۆڵابەکەوە کەوتە خوارەوە.

بە باوکم وت: "من باشم".

چاودێری میکام دەکرد چۆن وەکو گەردەلولی بەفر ئاردەکەی لەناو چێشخانەکە پەرش و بڵاو کردەوە. بەڵام لەو بارەوە هیچم بەباوکم نەوت، ماقوڵ نەبوو لە کاتێکی وەهادا پێی بڵێم میوانێکم لە ئاسمانەوە هاتووە.



باوکم ووتی: "ئێستا چی ئەکەی؟".

لەو کاتیدا میکا کەوتە پژمین، یەك لەدوای یەك هەر دەپژمی و پێدەکەنی.

بە باوکمم وت: "هیچ ناکەم، بەیارمەتیت باوکە، دەبێ ئێستا برۆم".

بەپەلە چوم بۆ چێشتخانەکە، میکام کردە باوەش، ئینجا خستمە سەر زەوی، پێم وت: "چی دەکەی؟!".

میکا هەر تەماشای دەکردم و پێدەکەنی، بە توندی وتم: "نابێ لە خۆتەوە و بێ رێگەپێدان دەست لەم شتانە بدەی".

لەوکاتیدا میکا بە دەنگێکی زۆر بەرز و وەڕەسکەر کەوتە قاو و قیژ. تەنانەت بە پەنجە توند گوێی خۆم گرت، پێم وابوو هەرگیز لە گریان و قیژاندن کپ نابێتەوە، نەش ئەبوو هەر پەنجەم لە گوێچکەمدا بێت تا پورە هێلین دێت، بیرم لە رێگەچارەیەك کردەوە تا گریانەکەی کپ بکەمەوە.

زمانم دەرکرد و پەنجەکانیشم لەسەر سەرم بڵاوەپێکرد، بە دەموچاوم هەڵسوکەوتی پێکەنیناویم دەکرد، بێ سود بوو.

ئینجا لەناو چێشخانەکە کەوتمە سەما، لەسەر یەك پێ دەوەستام، وەکو کەڵەشێر دەمقوقاند، بە هەموو لایەکدا بازم دەدا، بێ سود بوو.

ئینجا جامێك ئاردم برد و لەهەوا بڵاوم کردەوە، پێم وابوو بۆیە توڕە بووە چونکە نەمهێشتووە بە ئارد یاری بکات، بەڵام هەر کپ نەبوو. بگرە زیاتر هاواری دەکرد و منیش زیاتر هەستم بە گەمژەیی خۆم کرد.

دواجار گەیشتمە بیرۆکەیەکی زیرەکانە، لە پاڵ ئەو لەسەر زەوییەکە دانیشتم و بە پەنجە کەوتمە ختوکەدانی گەردنی، ئینجا هێور بۆوە و پاشان بە تەواوی کپ بوو، ئینجا منیش چیتر ختوکەم نەدا. بەڵام هەڵەکە لەمن بوو چونکە دیسان دەستی کردەوە بە گریان، دیسانەوە منیش کەوتمەوە ختوکەدانی و رومەتیم ماچدەکرد.

کامێلا لەوکاتیدا هەستم کرد دەست لێدان لە پێستی ئەو جیاوازبوو لە پێستی ئێمە.

دواجار دۆخەکە لە چێشتخانەکە ئارام بۆوە، بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ هەر خەریکی ماچکردنی رومەتی میکا بووم، جاروبار پشوم دەدا و بە نەرمی قسەم لەگەڵ دەکرد، پاشان ماوەی پشودانەکەم درێژ کردەوە، تا بەتەواوی دەستم هەڵگرت لە ماچکردن و ختوکەدانی.

دەبوایە چێشتخانەکە پاك بکەمەوە، بۆیە بەگوێرەی توانا هەرچی ئاردی پەرش و بلاو هەبوو هەموویم کۆکردەوە و خستمە ناو حەوزەکەوە. ئینجا لە پاڵ میکا دانیشتم و پێم وت :"لەسەر هەسارەکەی ئێمە نابێ خۆراك بە فیڕۆ بدرێ".

هەوڵمدا بەگوێرەی توانا نەرم و میهرەبان بم، نەوەکو دیسانەوە دەست بکاتەوە بە گریان. بەڵام هەر پەست و هەڵچو بوو. بە توڕەییەوە ووتی: "بەڵام من خەون دەبینم، لە خەونیشدا هەموو کارێك رەوایە".

زۆر تەنگاو دەبوم بەوەی هەموو ئەو شتانەی روو دەدەن تەنها خەونن، پێم وت: "ناکرێ لەگەڵ تۆدا خەون ببینم، چونکە من بێدارم، هەروەك ئەوەی لێرە دەژیم".

تائێستاش بە وردی وەڵامەکەی ئەوم لە بیرە کە وتی: "بەڵام من لێرە ناژیم، کەوایە دەبێ خەون ببینم".

زۆر لەو قسەیە سەرم سوڕما، بەڵام زۆر زیاتر سەرسام بووم کاتێك ووتی: "دەبێ پەلە بکەم بۆ گەڕانەوە بۆ سەر هەسارەکەم بەر لەوەی بێدار بمەوە، ئەگەر نا تا هەتا رێگای گەڕانەوە وون دەکەم".

خەریکبوو لە قسەکانی تەواو دەبوو لە پڕ دەنگی زنگی دەرگا هات، دیسان میکا سەری خۆی جوڵاند و پەنجەکانی لە گوێچکەیەوە دەجوڵاند، قیڕاندی: "ئەو تەلەفۆنە" ، وتم: "ئەوە پورە هێلینە".

نەمدەزانی چی بکەم، مەحاڵ بوو پێشوازی لە پورە هێلین بکەم و پێی بڵێم میوانێکم لەگەڵە لە ئاسمانی دەرەوە هاتووە، تاکە چارەسەر ئەوەبوو میکا بشارمەوە.

ئەوکات شوێنی زۆرم پێ دەزانی تامیکای لێ بشارمەوە، بەڵام گرفتەکە ئەوەبوو میکا ئەوەندە ئارام و لەسەرخۆ نەبوو بتوانی لە شوێنێك دایی بنێ و نەجولێ. بەڵکو



منالێکی بچکۆڵە بوو، هەر شتێك وەرەسی بکردایە دەیکرد بە قیژە و گریان. هەروەها نەمدەتوانی بڵێم میکا هاوڕێیەکی خۆمە و هاتووە بۆ سەردانیم، چونکە وەکو پێم وتی کامێلا لە من و تۆ نەدەچو.

جارێکی تر زەنگی دەرگا لێدرایەوە، دەبوو بە پەلە دەست بەکاربم. دواجار بە میکام وت: "وەرە بە یاری چاوشارکێ (خۆشاردنەوە) بکەین".

دیاربوو لە مەبەستم تێگەیشت.

پێم وایە ئەگەر ژیان لەسەر هەسارەیەکی تر هەبێ، بێگومان دەبێ شوێنێك هەبێ بۆ خۆشاردنەوە، کەوایە دەبێ کەسێکیش بیری لە یاری چاوشارکێ کردبێتەوە.

ئەوکات پێم وابوو یەکەم شت کە خەڵکی سەر هەر هەسارەیەك فێری دەبن یاری چاوشارکێیە. دەستی میکام گرت بردم بۆ نهۆمی سەرەوە، لەگەڵم هات و بەسەرسامییەوە تەماشای شتەکانی دەوروبەری خۆی دەکرد، پێم وت: "لێرە خۆت بشارەوە، هیچ دەنگت لێوە نەیات".

بۆ سێیەمین جار زەنگی دەرگا هاتەوە، بەپەلە دابەزیمە خوارەوە و دەرگام کردەوە، پورە هێلین سەراسیمە و ترساو دیاربوو، وەکو ئەوەی ئێستا لەسەر مانگەوە کەوتبم. بۆ ساتێك وامزانی میکا لە پشتمەوە لەدالانەکە وەستاوە.

پورم ووتی: "زۆر داوای لێبوردن ئەکەم چو، دەبوو چەند کاتژمێر بوایە لێرە بم، بەڵام ئۆتۆمۆبێلەکەم پەکی کەوت، بۆچی یەکسەر دەرگات نەکردەوە؟ چو تۆ باشی؟.. ئەم هەرایە چییە؟".

تورە نەبوو، بەڵام سێ پرسیاری لێکردم، بۆیە منیش سێ جار بۆی چەمیمەوە.

وتی: "بۆچی بەو شێوەیە دەچەمیەوە؟".

دیسان بەپەلە چەمیمەوە و وتم: "لەم ماڵەدا هەر کەسێك پرسیارێکی سەرنجراکیش بکات، بۆی دەچەمینەوە".

پورە هێلین بۆم چەمیەوە و چووە چێشتخانەکەوە، کە ئەو هەرا و زەنایەی بینی، پرسیارێکی دیکەی کرد و ووتی:"چو چیت کردووە!؟".

ئاردەکەم بە بیر هاتەوە، نەمدەزانی بڵێم چی، پاشان بیرم کردەوە ئێمە لە بۆنەی خۆشدا هەمیشە بە ئارد پیتزا دروست دەکەین، لەدایکبوونی برایەکی بچوکیش بێگومان بۆنەیەکی خۆشە.

وتم: "دەمەوێ پیتزا بخۆم".

کردمیە باوەش و ووتی: "چو بیر بکەوە، خوشکت ئەبێ یا برا؟".

بە متمانەوە ووتم: "برایەکی بچوك".

پورم منی برد بۆ گەرماو، بە فلچە جلەکانمی پاك کردەوە، پەیمانی پێدام بۆ نانی بەیانی پیتزام بۆ دروست بکات، هەستم کرد میکا لەم خواردنە بە تامە رۆڵی سەرەکی دەبێ.

هیچم نەخوارد، بەڵام ترسام لە چێشتخانەکە بمێنمەوە، پورم سەرکەوت بۆ ژوورەکەی من، پێم نەوت هیچم نەخواردووە. پورم لە ژووری دانیشتن دانیشت، بە پەیژەکەدا سەرکەوتم و وتم: "کەمێك بە میکانۆکانم یاری دەکەم".

بینیم میکا هەر بیری لە چاوشارکێ نەکردۆتەوە، هەر لەسەر پێخەفەکەم دانیشتوە و تەماشای کتێبێکی وێنەدار دەکات لەبارەی دیناسۆرەکانەوە و وردبینێکی بەدەستەوە گرتووە. کە چومە ژوورەوە سەری بەرز نەکردەوە، بەڵکو لێی پرسیم: "لەسەر ئەم هەسارەیە ئەم جۆرە ئاژەڵە زۆر هەن؟".

وتم: "وس"، ئینجا لە پاڵی دانیشتم و وتم: "ئەم دیناسۆرانە ئاژەڵی زۆر زەبەلاحن، بەر لە ملیۆنان ساڵ لەسەر زەوی ژیاون، بەڵام ئێستا هەموویان مردوون و لەناوچون".

چاوی میکا لەسەرسامیدا زەق بۆوە و ووتی: "بەبێ ئەوەی پەرە بسێنن؟".

سەرم لەقاند، ئینجا ووتی: "بەبێ ئەوەی بواریان بۆ برەخسێ و پەرەبسێنن و ببن بە مرۆڤ؟".

لەوکاتەدا هەندێ زانیاریم لەبارەی مێژووی زەوییەوە هەبوو، بەڵام ئەو پرسیارە زۆر سەیر و نامۆ بوو، نەمزانی چی وەڵام بدەمەوە.

ووتم: "ئەوکات مرۆڤ نەبوو".

ووتی: "کەوایە ئێوە لە کوێوە هاتوون؟".



بیرمچو بۆ ئەو پرسیارەیان بچەمێمەوە، بۆیە میکا چاوەڕانی هیچ وەڵامێکی لێ نەکردم بەڵکو ئاماژەی بە وشەکانی ناو پەرتووکەکە کرد و ووتی: "ئەم هەموو وێنە بچوکانە چین؟ زۆر وردن، بە رادەیەك کە تەماشایان دەکەم چاوم ماندوو دەبێ".

لە بیرم بوو کە پورە هێلین لە ژووری دانیشتن دانیشتووە، وا دەزانێ من بە میکانۆکانم یاری دەکەم.

پێم وت: "وس، ئەوانە ووشەن".

ووتی: "بەڵام سودیان چییە؟، بۆچی بەکاریان دەهێنن؟".

ئەستەمە پیت بۆ کەسێك شی بکەیتەوە کە خوێندەواری نەبێ.

وتم: ئەمانە بیست و هەشت پیتی جیاوازن.

قسەکەی پێ بریم و ووتی: "هەموویان لە یەکتر جیاواز نین، هەندێکیان لێك دەچن، مەبەستت ئەوەیە جۆرێکن لە وێنە، وا نییە؟".

وتم: "ئێمە پێیان دەڵێین پیت، پێکەوە کۆیان دەکەینەوە و وشەیان لێ دروست دەکەین، ئینجا تەماشای دەکەین و بەمەش دەڵێین خوێندنەوە".

میکا بە حەپەساویەوە تەماشای کردم، من درێژەم پێدا و وتم: "وشەکانی ناو ئەم کتێبە هەموویان لە بارەی دیناسۆرەوەن".

میکا کتێبەکەی بەرز کردەوە و لەدەموچاوی نزیکی کردەوە تا لە نزیکەوە تەماشای پیتەکان بکات، ئینجا لە ژێر وردبینەکەوە تەماشای کرد، پاشان کتێبەکەی فڕیدایە ناو ژوورەکە و ووتی: "بێ سودە، لە هیچ تێ ناگەم".

لێم پرسی: "حەز دەکەی بۆت بخوێنمەوە؟".

کتێبەکەم هێناو چیرۆکی دیناسۆرەکانم لەسەرەتاوە بۆ خوێندەوە و بە پەنجەی دۆشاومژە وشە بە وشە دیاریم دەکرد.

ووتم: "دیناسۆرەکان گەورەترین ئاژەڵن کە لەسەر زەوی ژیابن، بەڵام مرۆڤ هیچیانی نەبینیوە، چونکە دوایین دیناسۆر ٦٥ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر مردووە، ماوەیەکی زۆر بەر لەوەی مرۆڤ لەسەر زەوی پەیدا ببێت".

"زانایان شێوەی دیناسۆرەکانیان دیاریکردووە، دیناسۆرەکان لە ڕێی هێلکەوە گەشەیان کردووە، چونکە زانایان ئێسک و ددان و پاشماوە و هێلکەی دیناسۆرەکانیان لەناو بە بەردەکان دۆزیوەتەوە، دوای ئەوەی دیناسۆرەکان لەناوچون، مەمکدارەکان بوون بە گرنگترین جۆرەکانی بوونەوەر".

میکا قسەکەی پێ بریم و وتی: "مەمکدارەکان چین؟".

وتم: "ئەو ئاژەڵانەن کە بێچوەکانیان بە زیندووی لەدایك دەبن نەك لە ڕێی هێلکەوە، وەك پشیلە و مانگا و فیل و نەهەنگ".

دووبارە قسەی پێ بریمەوە و وتی: "بەڵام هەموو بێچوەکان بە زیندوویی لەدایك دەبن".

خەریکبووم جیاوازییەکی دیکەی بۆ ڕوون بکەمەوە: "مەمکدارەکان بەهۆی شیرەکانیانەوە بێچوەکانیان بەخێو دەکەن، بەڵام گوێم لێبوو پورە هێلین دەیوت: "چو نان دەخۆی؟".

بە پەلە ووتم: "نا... سوپاس". گەرچی بەڕاستیم نەبوو، پاشان گوێم لێبوو دەنگی پێی بە پەیژەکانا سەردەکەوێ، هاوارم کرد: "واهاتم".

بەرەو پەیژەکە ڕامکرد و خۆم کێشا بە پورمدا، پێی وتم: "چیت بەسەر هاتووە چو؟".

وتم: "هیچ... دەچم لە باخچەکە یاری دەکەم".

ئەگەر پورم سەری بکێشایەتە ژوورەوە، ڕووبەڕووی گەورەترین شۆك دەبوو لە هەموو ژیانیدا، بەڵام بۆ باشبوو گەڕایەوە و لەدوای منەوە هاتەوە نهۆمی خوارەوە.

بیرم لە ڕێگەیەك دەکردەوە میکا لە ماڵ بهێنمە دەرەوە، لە ڕێگابووم بچم بۆ باخچە، گسکێکی کارەباییم لە ژووری دانیشتن بینی، لە پورم پرسی: "گسك دەدەی؟".

ووتی: "بەڵێ.. ئارد لە هەموو شوێنێك بڵاوبۆتەوە".

ووتم: "ببورە پورە لەوەی بێزارم کردی، باشتر وایە چیتر بێزارت نەکەم چونکە تۆ خەریکی کاری".

سەری لەقاند و گسکەکەی هەڵکرد.



بە پەلە گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم، بینیم میکا لە شوێنی خۆی وەکو پەیکەر چەقیوە و بە دەستی گوێچکەی خۆی توند گرتووە.

ووتم: "ئەوە گسکی کارەباییە، ئێمە بۆ پاککردنەوەی زەوی بەکاری دەهێنین، دەی با بڕۆین بۆ دەرەوە".

دەستیم گرت و بە پەیژەکەیا چوینە خوارەوە.

هەستێکی جوان بوو کە دەستێکی بچوك و ناسك دەستی گرتبووم. کاتێك گەیشتینە هەیوانەکە، پورم خەریکی پاککردنەوەی چێشخانەکە بوو، لە بەختی منیش پشتی لە ئێمە بوو، نەیبینین.

میکا بە پەلە تەماشایەکی کرد و دیاربوو نەیدەویست بیناسێ، ئینجا بۆلای دەرگاکە چوین.

گەیشتینە باخچەکە، دیسانەوە میکا وەکو کەنگەر لە خۆشیدا کەوتە بازبازێن، هەر هاواری دەکرد، وەکو ئەوەی سەدان ساڵ بێت خەوتبێت و ئێستا بەخەبەر هاتبێ.

بەڵام من تەنیا سەرقاڵی یەك شت بووم، ئێمە نەماندەتوانی هەر لە باخچەکە بمێنینەوە، خانووەکەمان دەرگای زۆری هەبوو بەسەر باخچەکەدا دەیڕوانی، بەڵام بیرم لە پلانێك دەکردەوە.

# دەریا

بەرەو درەختی تریێ کێویەکەی کۆتایی باخچەکە رامکرد، بەو رێرەوە دەستی پێدەکرد کە بە دەریا کۆتایی دەهات ، تەماشای دواوەی خۆم کرد ، بینیم میکا بە لەنگە لەنگ بە دوامدا دێت، لەهەوادا باز دەدات و سەرمەقولان لێ دەدا ، بە هەر حاڵ بەدوامدا دەهات.

میکا لەسەر نوکی پێی وەستا، یەکێك لە درەختی تریێ کانی بۆن کرد، وردبینێکیشی پێ بوو، بۆ لای دەموچاوی نزیکی دەکردەوە ، ئینجا پێدەکەنی و کاتێك دەیبینی قەبارەی تریێ سورەکە گەورە دەکاتەوە شاگەشکە دەبوو. وەختێك لە پشت درەختەکانەوە خۆمان وون کرد پێم ووت: " هیچ دەبیستی ؟". وەستاو ساتێك گوێیێ هەڵخست ، ئینجا ووتی: " دەنگی خورە خوری ئاوە".

بە شادمانیەوە وتم: "ئەوە دەنگی دەریایە".

دابەرزینە رێرەوەکە، تا گەیشتینە سەر بەردێکی لوس لەسەر ئاسۆگەکە. کەمێك بەرزتر بوو لەو کەنداوەی کە بەلەمەکەمان لێی بەستبووەوە. ئەوە دوورترین شوێن بوو کە رێگەم پێ درابوو بە تەنها بچمە ئەو شوێنە. لەسەر گا بەردە لووسەکە دانیشتم کە دایکم ناوی لێ نابوو کورسیە بەردینەکە. میکاش لە پاڵم دانیشت. خۆر لە ئاسمان بەرز بووبوو، تیشکەکانیشی لەسەر رووی ئاوەکە دەبریسکایەوە. میکا بە دەست چاوەکانی هەڵگلۆفی. وەکو ئەوەی بەو خۆرە پرشنگدارە رانەهاتبێ. لە پڕ ووردبینەکەی بە ئاراستەی خۆرەکە بەرز کردەوە تا لە نزیکەوە بیپشکنێ. بەڵام لە ساتێکی گونجاودا رزگارم کرد.



پێم ووت :"وریابە، نەکەی هەرگیز شتی وا بکەی". لە پڕ دەستی کردەوە بە گریە و هاوار، تەنانەت ترسام پوورە هێلین گوێی لێبێ، بەڵام فێر بووبووم چۆن رووبەرووی ئەم دۆخە ببمەوە. بە پەنچە گەردنیم ختۆکەدا و پێم ووت :" بەسە .... بەسە" یەکسەر کپ بوو. ئێستاش لە بیرمە، من و باوکم، جارێکیان بە بەکارهێنانی ووربینێکی کۆن ئاگرمان کردەوە، بۆ میکام شیکردەوە ووربین تیشکی خۆر لە یەك خاڵدا کۆ دەکاتەوە، دەتوانرێت بە هۆیەوە پارچە کاغەزێك ئاگر بدرێ. میکا هەر بە دەنگێکی نزم دەگریا ، پێم وابێ دەیویست بەردەوامبم لە ختوکەدانی.

ووتی:" لە بارەی دەریاوە قسەم بۆ بکە ، ئایا ئاژەڵیان تێدایە".؟

ووتم :" ئاژەڵی زۆری تێدا هەیە".

ووتی :" ئایا دیناسۆری تێدایە؟" .

بە نەخێر سەرم لەقاند، ئینجا لە بارەی دەریاوە قسەم بۆ کرد.

حەزم لە لێکۆڵینەوەی مێژووی سرووشتی بوو، چەند کتێبێکم هەبوو لە بارەی دیناسۆرەکانەوە. لەو کتێبانەوە هەندێ زانیاریم لە بارەی مێژووی ژیان لەسەر زەوی فێربوو بووم. لەم بارەوە لەگەڵ باوکیشم زۆر قسەمان دەکرد. ئێستا کاتی ئەوەیە، ئەو شتانەی دەیانزانم میکا فێر بکەم.

ووتم: " ژیان لەسەر ئەم هەسارەیە لە دەریاوە دەستی پێ کرد" .

ووتی: " تەنانەت مرۆڤیش"؟.

بۆ ئەم پرسیارەی زیاتر چەمیمەوە و ووتم :" خەڵکی لەسەر ئەم زەویە پێیان وایە ژیان لەسەر ئەم هەسارەیە سێ هەزار ملیۆن ساڵە دەستی پێ کردووە. ئەمەش مانای ئەوەیە هەموو رووەك و ئاژەڵەکان لەسەر ئەم هەسارەیە بە شێوەیەك لە شێوەکان بە یەکترەوە بەستراون ".

میکا ووتی :" لە بارەی دیناسۆرەکانەوە قسەم بۆ بکە، چیرۆکی ئەوان چی یە؟".

ووتم چیرۆکێکی دوور و درێژە، بۆم کورت کردەوەو ووتم :" یەکەم بوونەوەرە زیندووەکان لە دەریادا ژیاون، زیندەوەری زۆر بچوك بوون، بە چاو نەدەبینران. بۆ ملیۆنان

ساڵ ئەو زیندەوەرانە تاکە زیندەوەربوون. ئینجا دەستیان کرد بە گۆڕان و گەشە سەندن. گۆڕان و گەشەکردنەکەشیان زۆر وورد بوو. بەڵام بە تێپەڕ بوونی کات جیاوازیەکان دەرکەوتن، هەزار ملیۆن ساڵ، واتە هەزار هەزار هەزار ساڵ ، ماوەیەکی زۆر درێژە ، بەسە بۆ روودانی جیاوازی گەورە".

یەکەم ئاژەڵ دوای ئەو پەرەسەندنە چرای دەریا و کرمەپانەکان بوون، کە جەستەیان زۆر نەرم بوو، قەبارەیان وای لێ هات دەتوانرا بە دەستی بگیردرێن.

"دوای ملیۆنان ساڵ لە دەریاوە ئاژەڵی توێکڵدار دەرکەوتن، جەستەیان بە توێکڵێکی رەق داپۆشرابوو، وەك رۆبیان و قرژاڵی دەریا. دڵنیا بووم میکا لە ژیانیدا یەك رۆبیان و یەك قرژاڵیشی نەبینیبووە. بەڵام درێژەم بە حیکایەتەکەم دا. ووتم دوای نزیکەی سەد ملیۆن ساڵی تر، زەریاکان پڕ بوون لە پۆلە ماسی، دواتر هەندێکیان گۆڕان و بوون بەو ئاژەڵانەی لە ئاو و وشکانیش دەژیان. خۆم دەمزانی دەستەواژەی زۆر قورس بەکا دەهێنم، بەڵام تازە فێری ئەو شتانە بووبووم، بۆیە حەزم دەکرد دووبارەی بکەمەوە تا راهێنانیان لەسەر بکەم.

میکا ووتی: " ئەو ئاژەڵانەی لە ئاو و ووشکانی دەژین ، ئێستا هەن؟" .

ئەو کات تەنها بۆق وکیسەڵم دەزانی. بەڵام پێم ووت :" زۆرێك لەو ئاژەڵانەی لەسەردەمە زۆر زووەکان هەبوون ئیستاش لەسەر زەوی هەن" .

میکا بە سوربوونەوە ووتی :" جگە لە دیناسورەکان نەبێت ".

ووتم :" دیناسورەکان دوای ئەوە دەرکەوتن: لەسەردەمانێکی دواتر، پاشان هەموویان قڕیان تێکەوت و هیچ جۆرێکیان نەماوەن" .

ووتی :" ئینجا دوای چی روویدا ؟" .

ووتم :" گیانەوەرە ئاوی و وشکاییەکان دەریایان جێهێشت، لە مێرگەکان ژیانیان دەستپێکرد و لەسەر رووی زەوی بڵاوەبوونەوە. دوای تێپەڕبوونی ملیۆنان ساڵی تر، هەندێ لە گیانەوەرە ووشکایی و ئاوییەکان گەشەیان کردوو بوون بە گیانەوەری خشۆك. دیناسۆرەکان جۆرێکن لە خشوکەکان. گەرچی دیناسورەکان لەسەر زەوی



نەماون، بەڵام جۆری دیکەی خشۆکەکان هەرماون. هەندێکیان تارادەیەك لە دیناسورەکان دەچن". میکا بەم برە زانیاریە وازی نەهێنا، ووتی :" تۆ لە چ جۆرە ئاژەڵێکەوە گەشەت کردووە؟".

ووتم :" من لە مەمکدارەکان، وەکو هەموو مرۆڤەکانی دیکە".

ئینجا ووتم :"مەمکدارەکان لە خشۆکەکانەوە گەشەیان کردووە. لەسەرەتادا جۆرە قەبارە بچوکەکان دەرکەوتن، کە چاویان زۆر گەورە و زۆریش زیرەك بوون. جەستەشیان بە موو داپۆشرابوو. ئێستا سەدان جۆریان هەیە. وەك شەمشەمەکوێرە و ئەسپ و گورگ و ئەسپی ئاوی. ئەم ئاژەڵانە هەموویان هێلکە ناکەن. بەڵکو بێچویان دەبێ. گەرچی پێشتر لەم بارەوە لە گەڵ میکا قسەم کردبوو، بەڵام هەر حەپەساو و سەراسیمە بوو".

ووتی :" ئەو شیردەرانە یەك هێلکەش ناکەن، لای کەم دوو هێلکە، پێش ئەوەی بێچووەکانیان گیانی بێتە بەر".؟

جارێکی تر پێکەنیم. میکا لە بارەی ژیانی ئەم سەر زەوییەوە زۆر بێ ئاگا بوو. بەڵام پرسیارەکەی تا رادەیەك بەجێ بوو. مێینەی مەمکدارەکان هێلکە بەرهەم دەهێنن. بەڵام زۆر بچوکە، بۆیە پێیان دەووترێت هێلکۆکە. توێکڵی ئەو هێلکۆکانەش ئەستور نییە، لەو هێلکۆکەیەوە لە سکی دایك کۆرپەلە درووست دەبێت. هەر لە سکی دایکی گەشە دەکات و بە تەواوی دەخەملێ و گەشە دەکات. ئینجا ئامادە دەبێت بۆ هاتنە دەرەوە بۆ ئەم جیهانە.

ئەم بەشەم بە درێژی بۆ میکا شی نەکردەوە، چونکە خۆم بە ووردی تێنەدەگەیشتم. میکا هەر لە پاڵم بوو، چاوی بریبووە دەریاکە کە هەموو بونەوەرێکی لێوە دەردەچو.

پاشان ووتی :" بەراستی هێلکە موعجیزەیە".

قسەکانی پڕ بوون لە دانایی، بەڵام نهێنی ئەوەم نەدەزانی بۆچی ئەوەندە گرنگی بە هێلکەو دیناسۆرەکان دەدات.

لە بارەی دەریاوە بۆ میکا دوام، چۆن لە دەریاوە ژیان دەستی پێکردوە، بەردەوامیش بووم لە ختوکەدانی گەردنی. دیار بوو چێژی لەو ختوکەدانە وەردەگرت. چونکە هەر کە

وەستام دەستبەجێ لەسەر بەردەکە بازی دا و بەرەو ئاوەکە رایکرد. منیش رێگەی ئەوەم پێ نەدرابوو بچم بۆ ئەوێ. بەڵام دڵنیا نەبووم میکا بتوانێت لەوێ مەلە بکات. نەم دەتوانی رووبەرووی خنکانی بکەمەوە. بۆیە لەسەر کورسیە بەردینەکە بازم داو کەوتمە دوای.

من دەچووم بۆ دەریاکە، بیرم هاتەوە میکا خورە خوری ئاوی دەزانی، کە وایە دەزانێ دەریا چییە.

لێم پرسی:" لەسەر هەسارەکەی ئێوە ئاو هەیە؟".

میکا بە توندی چەمیەوە ئینجا دەستی خستە ئاوەکەوە. چنگێك گیای دەریایی دەرکرد و لە هەوا بایدا. ئاوێکی سارد بە سەرماندا پرژە بوو.

ووتی:" ئەگەر لەسەر یەکێك لە هەسارەکان ژیانی بەبێ ئاو هەبێ، ئەوە بێ گومان ئەو ژیانە جیاوازە لە ژیانی سەر هەسارەکەی من و هەسارەکەی تۆ". لەوکاتیدا هەستم کرد دەبێ ئەو هەلە بقۆزمەوە کە چاوم بە بوونەوەری هەسارەیەکی تر کەوتووە و چیم دەوێ لێی بپرسم.

میکا زۆری لە بارەی ئاسمانی دەرەوە دەزانی. بەڵام لە بارەی ژیانی سەر ئەم هەسارەیە هیچی نەدەزانی. ئەو تەنها چەند کاتژمێرێك بوو هاتبووە سەر زەوی. لێم پرسی پێت وایە ئاو لەسەر لە هەسارەکانی تر هەبێت.؟  میکا بۆ پرسیارەکەم چەمیەوە، ئینجا سەری نەریێی لەقاند و ووتی:" نەخێر، ئەو هەسارانەی ئاویان لەسەرە، ناکرێ لە خۆرەوە زۆر نزیك بێت. ئەگەر نزیك بێت ئاوەکە دەبێت بە هەڵم. ناشکری زۆر لە خۆرەوە دوور بێ، چونکە ئاوەکەی دەبێتە بەستەڵەك". میکا ئەمەی ووت و بە سەر ئەو تەختەیەدا رۆیشت کە دەگەیشتە بەندەرەکە. ئینجا خۆی هەڵدایە ناو بەلەمەکەوە. بەلەمەکەش کەوتە لەرەلەر و لەرزین. ترسام میکا بکەوێتە ئاوەکەوە، بۆیە ووتم :" بوەستە، نابێت بە توندی باز بدەیتە ناو بەلەمەکەوە. ئینجا ترسام لەوەی دەست بکاتەوە بە هاوار و بۆرە بۆر. چونکە رێگەم نەداوە چی دەوێت بیکا. بۆیە بە پەلە پێم ووت : " حەز دەکەیت فێری سەوڵ لێدانت بکەم؟. گەر چی ئەم کارە بۆ من قەدەغەبوو. نەمدەتوانی باش سەوڵ لێ بدەم. بەڵام دەمتوانی میکا فێر بکەم چۆن سەوڵ بگرێ.



ئینجا کەوتمە سەوڵ لێدان بە سەوڵەکەی تر. ئەمەش ئەو رێگەیە بوو کە باوکم فێری کردم. کاتێکیش لە بەندەرەکە دەرچوین سەوڵەکانمان راکێشا. لێگەراین بەلەمەکە لەسەر ئاوەکە بوەستێ. لە ناو بەلەمەکە قولابێکی ماسی هەبوو. میکا چەمیەوە تا هەڵی بگرێ. بەر لەوەی وریای بکەمەوە. نوکی قولابەکە پەنچەی بریندارکرد، بەهۆی توندی ئازارەوە کەوتە هاوارو قیژە. باش بوو تەنها پەنچەی برینداری کردبوو، تیا نەچەقیبوو. بینیم پشکێك خوێن لە پەنچەیەوە هات. خوێنەکەی وەکو خوێنی ئێمە سور نەبوو، بەڵکو شینێکی تاریك بوو، مەیلەو رەش بوو. ئەو بونەوەرێك بوو لە ئاسمانەوە هاتبوو. لە ماسی دەریاوە گەشەی نەکردبوو، یا لایەنی کەم لە ماسی دەریاکانی ئێمە گەشەی نەکردبوو، ماسیەکانی لای ئێمە خوێنیان سورە، بەڵام رەنگی خوێنەکەی ئەو رەنگێکی تر بوو. دەشێ میکا هەر ئاژەڵێکی مەمکدار نەبێت. ئەی ئەگەر ئاژەڵێکی مەمکدار نیە چی یە، ئەی چی یە؟.

میکا بواری نەدام بیر لەم شتە بکەمەوە. دەستی کرد بە قیژەو و بۆرە بۆر. دیسان کەوتمە ختوکە دانی گەردنی. پێم ووت :" بەسە ... بەسە". یەکسەر کپ بوو.

بوارەکەم قۆستەوەو بۆ میکام شی کردەوە کە قولاپ بۆچی بەکاردێت. بەر لەوەی لە شیکردنەوەکەم تەواو بم، ئەو قولابەکەی فرێدایە ناو ئاوەکەوە. زۆر جار لەگەڵ باوکم بۆ راوە ماسی چو بووم، زۆر جار ماسیەکان خۆراکی قولابەکەی منیان دەخوارد، کە چی نەم دەتوانی راویان بکەم، تەنها جارێك نەبێت. بۆیە هەستم بە ستەم کرد کاتێك میکا لە یەکەم هەوڵدا راوی کرد. بینم داوی قولابەکە بە توندی لە ئاوەکەدا دەجولێ. بە چرپە ووتم: " ماسی خواردنەکە دەخوا خێرا داوەکە راکێشە ". دوای ساتێك بینیم ماسی ماگریل[*] لە ناو بەلەمەکە لەقەفرکێیەتی. میکاش هاوکات دەگریا و پێدەکەنی. وەکو

[*] **ماسی ماگریل:** زۆرێك لە ماسییە گرانبەها و بەنرخەکان پێیان دەوترێ ماسی ماگریل. ئەم ماسییە بەوە جیادەکرێتەوە کە رەنگی جوان و رەنگاو رەنگی هەیە. درێژییەکەی ٤٥ — ٢٥ سم و کێشیشی ١,٥ کگم (و.ك).

ئەوەی پێشتر ماسی زیندووی نەبینبێ. نەی دەوێرا نزیکی بکەوێتەوە. فێرم کرد چۆن ماسیەکە بگرێ و لە قولابەکەی بکاتەوە و مرداری بکاتەوە. ئینجا ماسیەکەمان کردە سەتڵی ماسیەکەوە.

ووتم :"داوا لە پورە هێلین دەکەم بۆمان لێ بنێ. تا لە گەڵ پیتزادا بیخۆین".

میکا ووتی: " پیتزا چییە؟".

ووتم :" جۆرێکە لە کولێرە. پورە هێلین بەم بۆنە خۆشەوە بۆمان ئامادە دەکات".

پەیمانم پێدا دوو سێ دانەی بۆ هەڵگرم.

ویستم بزانم میکا پێشتر راوی کردووە. یاخود ماسی ماگریل یەکەم بەختیەتی دەیگرێت.

ووتم :" لە دەریاکانی هەسارەکەی تۆ ماسی زۆر هەیە"؟.

میکا سەری نەرێی لەقاند، دیابوو دەیویست بگری، بە ئارامیەوە ووتم" بیگومان جۆری دیکەی ئاژەڵ هەیە، ئایا راویان دەکەن؟" جارێکی دیکە سەری نەخێری لەقاند. ووتی: "لە دەریای هەسارەکەی من ئاژەڵ و رووەکی زۆر لێ هەبوو، بەڵام ئاوەکانی پیس بوون و هەموو ئەو بوونەوەرانە مردن کە تیایاندا دەژیان".

هەواڵێکی زۆر بە ئازارو ترسێنەر بوو. خەریك بوو منیش بمرم، بۆ ئەوەی هەستەکەم بشارمەوە پێشنیارم کرد دەست بکەینەوە بە سەوڵ لێدان. لە رێگای گەڕانەوەمان، دۆلکەی ماسیەکەم هەڵگرت، کە ماسیەکی ماگریلی تێدا بوو. میکاش ووردبینەکەی پێ بوو کە لەسەر کورسیە بەردینەکەی دانابوو. هەموو شتێکی دەپشکنی. هەوڵی دەدا ئەو مێشە سەوزانە بپشکنێ کە بە چوار دەوری گژوگیا و گوڵەکاندا دەخولانەوە. بەڵام هەرگیز بێدەنگ نەدەبوو. وەکو ئەوەی نەیەوێ کەس مشەخۆری بە سەردا بکات. میکا بانگی کرد: " لە پیت بچوکترە، ئایا سەیر نییە بونەوەرێك بەو بچوکیەوە، بەم رادەیە زیندوو بێت"؟.

وەڵامی پرسیارەکەیم نەدایەوە، بەڵام بۆی چەمیمەوە. چونکە قسەکەیم پێ راست بوو. دوای کەمێك کیسەڵێکی بینی بە سەر بەردێکدا تێپەڕ دەبوو. کشایە دواوەو ووتی:"ئەمە چییە؟".



ووتم :" ئەمە کیسەڵە، جۆرێکە لە خشۆکەکان".

ووتی:" وەك دەیناسورەکان؟".

ووتم :" بەڵێ، خشۆکی زۆر لەمەش گەورەتر هەیە، وەك تیمساح، پێستەکەشی وەکو پێستی دیناسۆرەکانە، بەڵام لەرووی قەبارە لە دیناسۆر بچوکترە. هەموویان پلەی گەرمی لەشیان چەسپیو نییە، واتە ناتوانن پلەی گەرمی جەستەیان راگرن. جەستەیان بە گوێرەی پلەی گەرمای کەش و هەوای دەوروبەر دەگۆڕێت. بۆیە دەبینی خۆی داوەتە بە خۆر تا گەرم بێتەوەو ووزە بە دەست بێنێت و بجولێت "، میکا لە سەرسامیدا چاوەکانی زەق بوو .

ووتی:" ئەم خشۆکانە دەتوانن قسە بکەن"؟.

پێکەنیم و ووتم :" نەخێر، نەگەیشتونەتە ئەم رادەیەی گەشە، تەنها مرۆڤ دەتوانێ قسە بکات". لەو ساتەدا پشیلەیەکمان بینی لەسەر رارەوەکە بەرەو رومان دەهات، چەمیمەوە تا هەڵی بگرم، مووەکەی زۆر نەرم بوو، پشیلەکەش دەمیاواند و پاشان نوزایەوە.

میکا ووتی :" لەو ووشەیە تێ ناگەم کە دەیڵێ ".

ووتم :"چونکە پشیلە قسە نازانێ" .

ووتی :" بەڵام گوێم لێ بوو دەیوت میاو ...میاو... ئینجا ئەم دەنگەی لێوە هات". هەوڵی دەدا وەکو پشیلە بنوزێتەوە .

پاشان ووتی:" ئایا ئەمە قسە نی یە؟ ئەگەر قسە ناکات، کەوایە بیر ناکاتەوە". وەڵامی ئەم پرسیارەم نەدەزانی، دەمزانی ئاژەڵەکانی دیکە، وەکو مانگاو پشیلە وەکو ئێمە بیر ناکەنەوە. دەشمزانی هەندێك ئاژەڵ دەتوانن هەندێ راهێنان فێربن، بەڵام دڵنیا بووم پشیلە نازانێ لەسەر هەسارەیەك دەژی کە لەم ئاسمانە فراوانەدا بە دەوری خۆرێکدا دەخولێتەوە.

میکا ووتی :" ئایا پشیلە لە خشۆکەکانە؟".

وتم:" نەخێر ... پشیلە لە خشۆکەکان نییە، لە ئاژەڵە ووشکایی و ئاوییەکانیش نییە، بەلکو لە شیردەرەکانە".

ووتی:" کەوایە هێلکە ناکات".

ووردبینەکەی بۆ رووی پشیلەکە بەرزکردەوە تا لوتی پشکنی.

ووتی: "دیاره له بۆنکردنی شتەکان زۆر بەتوانایە".

لەو کاتەدا پشیلەکە دوور کەوتەوە و ئێمەش لە ماڵ نزیـك بوینـەوە. بـیرم کـردەوە میکا چۆن له پوره هێلین بشارمەوە. دواجار وتم :" حەز دەکەی لای کولانەکـە چـاوەڕیم بکەی و بە ووردبینەکەت ئاژەڵە بچوکەکان بپشکنی؟ هەر کـاتێکیش ڕێگـە سـەلامەت بوو دێم بۆ بینینت". چـومە ژوورەوە و سـەتڵی ماسـیەکەم پـێ بـوو، بینـیم پـورم لـە بەرامبەرم وەستاوە. نەمدەزانی لە بارەی ئەو ماسیە ماگریلەوە چی بڵێم. دیاربوو پـورم لە ماسیەکە تۆقی چو، وەکو ئەوەی دڕندەیەکی ترسناك بێت.

ووتی :" ئەوە چیت پێ یە ؟" .

بە شانازیەوە ووتم: "ئەمە ماسی ماگریلە، ماسیش ئاژەڵێکە لە ئاودا نەبێت نـاژی، ئەم ئاژەڵە بربڕە دارە، واتە لەو ئاژەڵانەی بربڕەی پشتیان هەیە. ماسی وەکو ئێمـە سـی نییە تا هەناسەی پێ بدات. بەڵکو بە هۆی ڕیـشوەکانی لاملیـەوە لـە ئـاودا ئۆکـسجین بەدەسـت دەهێنـێ. لـە گـەڵ ئەوەشـدا ئێمـە پێـی دەگەینـەوە، چـونکە ئێمـەش لـە خشۆکەکانەوە گەشـەمان کـردووە. خـشۆکەکانیش لـە ئاژەڵـە وشـکایی و ئاویەکانـەوە کەشەیان کردووە. ئاژەڵە وشکایی و ئاویەکانیش لەو ماسیانەوە گەشەیان کردووە کە لـە ئاودا هەن". پورم پێکەنی و دەستی بە سەرمدا هێناو ووتی:" دەزانم تۆ هەر بە زگمـاك زانای سروشتی، بەڵام دەکرێ پێم بڵێی ئەم ماسیەت لە کوێ هێناوە"؟، وەڵامم بۆ ئـەم پرسیارە ئامادە نەکردبوو، بۆیە هەموو ئەو زانیاریانـەی پێـشوترم بـۆ ڕاڤـەکرد". دوای کەمێك بیرکردنەوە، ووتم :" کەسێك ڕاوی کرد". ئەم وەڵامـەش ڕاست و وورد بوو، سەیر ئەوە بوو پورم هیچ پرسیاری دیکەی نەکرد. بەڵکو دۆلکەکـەی بـرد و لـە چیـشتخانەکە داینا. لەو کاتەدا هەستم کرد بە پـاککردنی ماسـیەکە ئـەرکیم قورسـتر کـردووە. دوای ئەوەی چێشتخانەکەی پاککردەوە. لە کاتی نانخواردندا بـاوکم دوو جـار پەیوەنـدی کـرد. وتی منالەکە هێشتا نەهاتووە. دایکیشت باشە و سـلاوی بـۆت هەیـە. هـەر لـە کـاتی



نانخواردندا دوو جار چوم بۆ گەرماو، هەر جارێکیش نیو کولێرەم دەبرد و لە ناو پۆتینەکەم دەمشاردەوە کە لە دالآنەکەدا بوو. دوای نان خواردن، پورم ووتی :" ئێستا چی دەکـەی؟ حەز دەکەی بچی بۆ کەناری دەریاکە؟".

بە پەلە ووتم: " نەخێر، کارم زۆرە".

ووتی:" کەوایە کەمێك لە باخچەکە دادەنیشم، ئینجا هەندیك خواردن لێ دەنێم تـا کاتێك دایکت بە منالەوە لە نەخۆشخانە گەڕایەوە ئیشەکانی کەم بوبێتەوە".

پورم هەستا قاپ و کەوچکەکانی شوشت، من یەکسەر چوم بۆ کولانەکـە تـا میکـا ببینم، بەڵام لەوێ نەبوو.

# هێلکە

بۆ سۆراخی میکا بەچواردەوری ماڵەکەدا ڕامکرد، بینیم لەلای گۆڕەپانی مریشکەکان دانیشتوە و هێلکەیەکی بەدەستەوەیە.

بانگی کردم: "سەیرکە، مریشکەکان هێلکەیان کردووە"، وەکو ئەوەی ئەو شتە شتێکی سەروئاسا و سەرنجڕاکێش بێت.

لەو کاتەدا ئێمە هەندی مریشکمان بەخێو دەکرد هەر بۆ جوانی و خۆشی، بەڵام هێلکەشیان بۆ دەکردین کە بەشی ژەمی بەیانیانی دەکردین.

بە وریاییەوە وتم: "ئاگادار بە".

بە ویقارەوە سەری راوەشاند و وتی: "مەترسە، ئاگادارم، دەشێ لەم هێلکەیەوە ئاژەڵێکی بچوك دەربچێ".

وتم: "پێی ئەڵێن جوجەڵە، واتە باڵندەیەکی بچوك، باڵندەکان ملیۆنان ساڵ لەمەوبەر لە خشۆکەکانەوە گەشەیان کردووە، هەروەك گەشەکردنی مەمکدارەکان":

میکا ئاماژەی بە مریشکەکە کرد و لێی پرسیم: "ئەم مریشکانە چەند هێلکە دەکەن؟".

بە توندی بۆ ئەو پرسیارە چەمیمەوە و وتم: "هەندێکیان هەموو رۆژ هێلکە دەکەن، بەڵام زۆرینەی باڵندە وشکانیەکان وخشۆکەکان لە یەك ساڵدا تەنها یەك هێلکە دەکەن".

حەپەسانێکی فراوانم لەسەر روخساری میکا بینی، نەمتوانی خۆم بگرم و پێ نەکەنم.

درێژەم بە قسەکەم دا: "مرۆڤ هەزاران ساڵە مریشك ماڵی دەکا، زیاتر ئەو مریشکانە هەڵدەبژێرن کە هێلکە زۆرتر دەکەن، هەروەك ئەو مانگایانە هەڵدەبژێرن کە شیری زۆرتر دەدەن، یا ئەو مەڕانەی خوری زۆرتر دەدەن، یا ئەو بارگیرانەی بەهێزتر و خێراترن، ئێمە بەهەموو ئەو ئاژەڵانە دەڵێین ئاژەڵە ماڵییەکان".



میکا بە وریاییەوە هێلکەکەی دانایە سەر زەوی، ئینجا بە خێرایی لە پەرژینەکە چوە دەرەوە. بینیم پورە هێلین بەرەو باخچەکە دێت و کورسیەکی نوشتاوەی بەدەستەوەیە، من و میکا خۆمان دزیەوە و چوینە ماڵەوە، ئینجا چوینە چێشتخانەکەوە، لەوێ میکا توێکڵی ئەو هێلکەیەی بینی کە پورم لەسەر قاپەکە بەجێی هێشتبوو دوای ئەوەی پیتزای ئامادە کردبوو. میکا لەو دیمەنە تۆقی چو، تەنانەت بە دەستەکانی چاوی گرت. لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر خوانەکە دانیشت و ئەو ژەمەی خوارد کە بۆم شاردبۆوە، جل و بەرگ و دەموچاوی خۆی هەموو کردە مرەباوە.

کاتێك تەواوبوو بردمە گەرماوەکە و لەناو حەوزی خۆشوشتنەکە کورسیەکم بۆ دانا. لەوکاتیدا هەستم بە شتێکی سەیر کرد، تا ئەوکات سەرنجم نەدابوو، بۆیە پێشتر بۆم باس نەکردبووی. سەرنجمدا میکا ناوکی نییە، بیهێنە پێش چاوی خۆت کامێلا، بزانە لەوکاتیدا چەندە ترساوم؟.

هەموو مرۆڤێك لەناوەڕاستی سکی ناوکی هەیە: چونکە کاتێك لەناو سکی دایکیەتی، بەهۆی لولەیەکەوە کە بەستراوە بە ناوکیەوە خواردن دەخوات، کە پێی دەوترێ (ناوکە پەتك).

بەڵام میکا ناوکی نەبوو، کەوایە چۆن لەدایکبووە؟

زۆر پەشۆکام، نەمدەزانی چی بکەم، یا چۆن بیر بکەمەوە، پەلەم کرد و میکام بە خاولی وشك کردەوە و دامبەزاندە سەر زەوی، چوین بۆ نهۆمی سەرەوە و بردمە ژووری برا بچوکەکەم، ئاماژەی بە لانکەکە کرد و سەرکەوتە سەری و تیایدا درێژ بوو، ئینجا کەوتە ڕاژەندنی، وەکو ئەوەی بیەوێ بزانێ بۆ چی بەکاردێت، ئینجا دەستی کرد بە پێکەنین.

وتم: "ئەمە بێشکەیە، واتە پێخەفە، برا بچوکەکەم تیایدا دەخەوێ".

میکا وەڵامی دایەوە: "زۆر خۆشە"، دیسان تەنگەتاو بوو و وتی: "دەبێ بەپەلە بگەڕێمەوە بۆ سەر هەسارەکەم بەر لەوەی لە خەو بەخەبەر بێم".

ئینجا تەماشای دەوروبەری خۆی کرد و ووتی: "کەوایە هێلکەکە لە کوێیە"؟.

لەو ساتەدا لە پڕ شتێکم بە بیردا هات.

کامێلا، حەزی شت زانینت وروژا؟

لەگەڵ میکا دابەزین و چوینە ژووری دانیشتن، لەسەر رەفەی خوارەوەی دۆڵابەکە ئەلبوومی وێنەکانی لێبوو، لەسەر دۆڵابەکە دامنا و لەسەر کورسیەکە دانیشتم، و میکاش لەتەنیشتم دانیشت، وتم:" ئەمە ئەلبومە، واتە پەڕاوی وێنە".

میکا چاوی بریە من، دیاربوو لە ژیانیدا ئەلبومی وێنەی نەبیستبوو.

وتم: "تکایە کەمێك چاوەڕێ بە"، چوم بۆ ژوورەکەی خۆم و کامیراکەم بۆ هێنا، دڵنیاشبووم لەوەی گڵۆپەکەی کار دەکات، بەپەلە دابەزیم و وێنەیەکی میکام گرت، ویستم سکیشی لە وێنەکە دەربچێ، تا هەموو ئەو کەسانە دڵنیا بکەم کە تەماشای دەکەن بزانن ناوکی نییە.

وێنەکەم گرت، ناتوانم دەنگی داخستنی شاشەکە لە بیر بکەم، ئەگەر میکا دوای ئەوە وون بووبێ، ئەوە من دڵنیام بەڕاستی چاوم پێی کەوتوە.

میکا لە روناکی گڵۆپەکە تۆقی چو، دیسان گەردنیم ختوکەدا بەر لەوەی دەست بکات بە گریان، پاشان ئەلبومی وێنەکەم بۆ کردەوە و پێیم وت:"ئەمە پەڕاوی وێنەی بنەماڵەکەمە، وێنەکەی تۆش لەگەڵ وێنەکانی خۆمان دادەنێم".

ئەلبومەکەم هەڵدایە و وێنەی دایکم و باوکمم بە منداڵی پیشاندا، ئینجا وێنەی دایکمم و سکە پڤدراوەکەی، بەر لەوەی منی ببێ. وتم: "ئەمە وێنەی منە کاتێك لە سکی دایکمم، بەر لەوەی بێمە ناو ئەم جیهانەوە".

دواجار میکا تێگەیشت، چونکە منگە منگێکی کرد و وتی: "کۆرپەیەکی زیندوو".

لاپەڕەکانی ئەلبومەکەم هەڵدایەوە تا گەیشتمە ئەو وێنەیەك کە باوکم وێنەی دایکمی گرتووە کە شیرم پێدەدا. وتم : "ئەمە وێنەی منە کاتێك برسیم بووە و شیری دایکم دەخۆم".

میکا چاوەکانی زەقکردەوە و ووتی: "شیر!!!".

پێکەنیم، چونکە میکا لە مانای وشەی مەمکدارەکان تێنەگەیشتبوو، بێگومان ناشزانێ شیر مانای چییە.



وتم: "شیر  خۆراکی ئەو منالآنەیە کە تازە لەدایکبوون".

میکا لە ئەلبوومەکە دوور کەوتەوە وەکو ئەوەی، ئەو وێنەیەی من کە شیرم دەخوارد بوبێتە هۆی بێزهاتنەوەی.

پاشان ووتی: "چۆن من و تۆ تا ئەم رادەیە پێك دەچین؟ کە تۆ ئاژەڵێکی مەمکداری و من وا نیم؟".

ئەوە هەمان شت بوو کە بیرم لێی دەکردەوە.

هەستم کرد میکا بیری منی خوێندۆتەوە، تەنانەت من بۆ ئەو پرسیارە نەچەمیمەوە.

چۆن پێشتر ئەو شتەم بە مێشکدا نەهاتووە؟ میکا لە هەسارەیەکی زۆر دوورەوە هاتووە، هەسارەیەك مێژووەکەی تەواو جیاوازە لە مێژووی زەوی، چۆن من و ئەو تا ئەم رادەیە پێك دەچین؟".

ئەم شتە بۆ من هەر بە مەتەڵی مایەوە، تا میکا لێکی دایەوە، ئێستا بۆ تۆشی لێکدەدەمەوە کامێلا.

لەو ساتەدا، گوێم لێبوو پورە هێلین لە باخچەکەوە دەهات و دەیوت: "تۆ لە کوێی چو؟"، بۆچی نایەیتە دەرەوە و لە باخچەکە یاری بکەی، تا ئەوکاتەی کۆرپەکە دێتەوە؟".

لە دەرگای ژووری دانیشتنەکەوە تاماشام کرد بینیم لە دالآنەکەیە، وتم: "من ئێستا لە دەرەوەم".

وتی: "من خەریکی چێشت لێنان دەبم".

پورم چوە چێشتخانەکەوە، دەستی میکام گرت و لە دەرگای پێشەوە چوینە ناو باخچەکەوە.

سەرکەوتینە سەر گردۆلکەیەکی بچوکی بەرامبەر ماڵەکەمان، دایکم و باوکم بەو گردۆلکەیەیان دەوت (تەپۆلکە)، لەلای کۆمەڵە بەردێك دانیشتین، کە من و باوکم رێکمان خستبوو، لەوێوە چاودێری ماڵمان دەکرد، لە پشتیشەوە کەنارێکی بەردەڵآن هەبوو ئینجا دەریابوو.

بالّندە نەورەسەکان دەیانقیژاند و دەیاننالاّند، ئەمەم بەبەخت باشی زانی: چونکە دەنگی قیژەیان دەنگی میکای وون دەکرد ئەگەر دەستی بکردایەتەوە بە گریە و بۆڕە بۆڕ.

لەو بەیانییەدا کاتێك لەسەر ئەو کورسییە بەردینەی بەسەر کەنداوەکە دەینۆڕی دانیشتین، بۆم میکام باسکرد چۆن ژیان لەسەر زەوی دەستی پێکردووە، ئینجا نۆرەی ئەوبوو باسی ژیانی سەر هەسارەکەی خۆیم بۆ بکا کە لێوەی هاتبوو. تا ئەوکاتیش هەر جاروبار دەستی لەدەمی دەنا، دەستی ئاوەڵا دەکردەوە و دەیجولاّند. بەڵام من کامڵ و دانام دەهاتە بەرچاو، هەروەکو باوکم بۆ نموونە، کاتێك دەستیکرد بە گێڕانەوەی ژیان لەسەر هەسارەکەیان. ووتی: "ئەو هەسارەیەی من لێوە هاتووم ناوی "ئیلیو"ە، لەوێ بەر لە هەزاران ملیۆن ساڵ ژیان لە دەریاکانەوە دەستی پێکردووە، کەس نازانێ چۆن دەستی پێکردووە و چۆن پەرەی سەندووە، بەڵام چەندەها ئاژەڵی جۆراوجۆر و هەمەجۆر لەسەر رووی ئیلیو هەن".

ئەمە رێك هەمان ئەو شتە بوو کە لەسەر زەوی روویدابوو، گەرچی من و میکا لە هەسارەی جیاوازەوە هاتبووین، بەڵام ئەو شتانەی لەسەر ئەو دوو هەسارەیە روویاندابوو لە یەکتر دەچون.

ووتی: "سەدان ملیۆن ساڵە، ئاژەڵێك لەسەر ئیلیو دروست بووە پێی دەوترێ "مامبۆ"، هێلکەیەك دەکەن کە توێکلّێکی ڕەقی هەیە، لەسەر هەسارەی ئیلیو ئاژەڵێك نییە بەبێ هێلکە بێچوی ببێ".

یەکسەر ووتم: "کەوایە خەڵکی ئەوێ چۆن لەدایکبوونە؟".

میکا سەرقاڵی قسەکانی خۆی بوو و بۆ پرسیارەکەی من نەچەمیەوە، بەس پەنجەکانی دەجولاّند و ووتی: "لەسەر هەسارەکەی ئێمە هیچ دیاردەیەك رووی نەدا ببێتە هۆی لەناوچونی مامبۆ، بۆیە ملیۆنان ساڵە گەشە دەکەن و پەرە دەسێنن، ئێستا جۆرێك مامبۆ هەیە دەتوانن قسە بکەن و بیر بکەنەوە و لە بۆشایی ئاسمان بەدوای شتی ئاڵۆزدا بگەڕێن، منیش جۆرێکم لەو مامبۆیانە".

بینیت کامێلا؟، ووتی: "من جۆرێکم لەو مامبۆیانەی کە بیر دەکەنەوە".



میکا درێژەی بە قسەکانیدا و ووتی: "کاتێك وەختی ئەوەم هات بێمە دونیاوە، لەناو هێلکەیەك پاڵ کەوتبووم، کە دایکم و باوکم لە ژوورێکی گەرم لەسەر سەرینێك دایاننابوو. بۆ یەك چرکەش هێلکەکەیان بەجێ نەدەهێشت، لای ئێمە لە ئیلیو، ئاژەڵ هەیە هێلکەی ئەوانی تر دەدزن".

"کەس و کارەکەم منیان لەناو عەرەبانەیەکی بچوك دانابوو، بۆ هەر کوێیەك بچونایە لەگەڵیان خۆیان دەیانبردم، بەو هێلکەکەیان دەوت گەنجینەی بەنرخ، لەسەر هەسارەی ئیلیو هێلکە بە گەنجینەیەکی زۆر گرانبەها دادەنرێ".

ئەوکات زانیم میکا چۆن لەدایکبووە.

ووتی: "وام لێهات دەست و قاچم بەهێزبوون، هەر کات لەقەم لە هێلکەکە بدایە یا دەستم بجولاّندایە هێلکەکە درزی دەبرد، کەس و کارەکەم هەر هەموویان لە دەوری بێشکەکە کۆبووبونەوە چاوەڕێ بوون".

لەسەرسامیدا هاوارم کرد: "پاشان تۆ لە هێلکەکە هاتییە دەرەوە".؟!

میکا سەری بەڵێی لەقاند و ووتی: "هیچ شتێك لەبارەی ئەو شتەی روویدا نازانم، بەڵام بێگومان تیشکی رووناکی لەچاوی دام، ناو هێلکە زۆر تاریك و کپ بوو، پێم وایە من لەسەر پشت پاڵ کەوتبووم و دەستم خستبووە دەمم، هیچم نەدەکرد".

کامێلا گوێت لێبوو میکا چیی وت؟، هەموو ئەو شتانەی میکا لەبارەی هەسارەکەی خۆیەوە بۆی گێڕامەوە زۆر سەیر و سەرنجڕاکێش بوون، بەڵام راستیەکەی هیچی کەمترنەبوو لەوەی من لەبارەی مێژووی زەوی و برا بچوکەکەمەوە بۆم گێڕایەوە کە ئەوکات وەختی لە دایکبوونی بوو، لەرووی نامۆیی و سەرنجڕاکێشییەوە.

ئەوکات بۆم دەرکەوت بۆچی ئەستەم بوو بۆ میکا لە مانای ئاژەڵە مەمکدارەکان تێ بگا.

بەڵام من ومیکا سەیرترین شتی بابەتەکە بووین، چۆن ئاوا لە یەکتر دەچین و بە شێوەی جیاوازیش گەشەمان کردووە؟.

# چیا

كامێلا تا ئێستا بە گومانم لەوەی لەسەر هەسارەیەكی تر ژیان هەبێت. تا ئێستاش لەمەڕ پەرەسەندنی ژیان و گەشەكردنی بونەوەرەكان لە خانەیەكەوە بۆ بونەوەری ژیر و بیركەرەوە سەرە گێژكەمە. تا هەنوكە دەپرسم: ئایا یاساكانی پەرەسەندن لە گەردوون بە گشتی هەمان یاسایە؟ ئەگەر وایە بێگومان لەوێش ژیان لە رووەك و ئاژەڵە زۆر وردەكانەوە دەستی پێكردووە، پاشان بە گوێرەی گۆڕانی ژینگەی دەوروبەری پەرەی سەندووە.

هەندێك پێیان وایە هەسارۆكەیەك لەسەردەمی زوودا خۆی كێشاوە بە زەوییداو بووە هۆی قڕتێكەوتنی دیناسۆرەكان، واتە قڕبوونی دیناسۆرەكان تەنها رێكەوتێك بووە و رێڕەوی مێژووی سروشتی گۆڕیوە، هەروەك ئەوەی خەڵاتی یانسیب دەبەینەوە. چونكە ئەگەر ئەو هەسارۆكەیە خۆی نەكێشایە بە زەوییدا ئەوە دیناسۆرەكان بەردەوام دەبوون لە پەرەسەندن و گەشەكردن، رەنگە لە رەگەزی ئەوان بونەوەری ژیر دروست ببوایە و شاریان ئاوەدان بكردبایە و نەخۆشخانەیان بونیادنابا. هەروەها كەشتی ئاسمانی و كۆمپیوتەریان داهێنایە، یا زانكۆ و یاریگای وەرزشییان بونیاد بنایە.

كاتێك ئەو هەسارۆكەیە تەقیەوە، لە بۆشاییدا ملیۆنان تەن بەرد و تۆز پەرت و بڵاو بوونەوە، پاشان گەرمی خۆر قەتیس بوو، لە ئەنجامی ئەمەشدا پلەی گەرمی بۆ ژێر سفر دابەزی و زۆرێك لە رووەك و ئاژەڵەكان مردن. تەنیا ئەو ئاژەڵانە مانەوە كە بەرگەی سەرمایان دەگرت.

بەگوێرەی ئەم بۆچونە مرۆڤ لە مەمكدارەكانەوە پەرەی سەندووە كە بەرگەی سەرمایان گرتووە و درێژەیان بە ژیان داوە، هەر بۆیە مرۆڤ بوو بۆ یەكەمجار گەیشتە سەر مانگ.



بەڵام خشۆكەكان پاشەكشەیان كرد و چیتر نەیانتوانی ململانێی مەمكدارەكان بكەن لە گەشەسەندندا.

میكا ووتی: "كاتێك لە هەسارەكەی خۆتەوە سەردانی هەسارەیەكی تر دەكەی جوانترین شت ئەوەیە، لەبارەی هەسارەكەی خۆتەوە زانیاری زیاتر پەیدا دەكەی. ئەگەر بەرادەیەكی كەمیش بێت. هەموو هەسارەیەك وەكو دەزانین باشیی و خراپیی خۆی هەیە".

میكا ئەوكات تەواو لەباوكم دەچو، تەنیا ئەوە نەبێت كاتێك باوكم بیری دەكردەوە پەنجەی نادەختە دەمی، كاتێكیش قسەی دەكرد دەستی بڵاونەدەكرد و لەهەوا بیجوڵێنێ.

میكا ووتی: "ئەگەر تۆ لەسەر چیا بژیت، باشتر وایە هەڵزنەرێكی باش بیت، بەڵام ئەگەر لەسەرزەوییەكی سادە و تەخت بژیت، باشتر وایە خۆشڕۆیەكی بە توانا بیت، بەڵام ئەگەر دراوسێی ئاژەڵی درندە بیت، باشتر وایە تامت ناخۆش بێت، واتە ژەهراوی بیت، لەهەموو ئەو شتانە باشتر وایە كارامە و زیرەك بیت".

سەری بەڵێم بۆ لەقاند.

ووتی: "رەنگە ئەم یاسایە لە هەموو هەسارەكانی تر هەر هەرمان شت بێت". وتم:"بەوردی مەبەستت چییە؟". میكا بە شكۆوە چەمیەوە. ئینجا ووتی: "پێت وا نییە ئێمە لە یەكتر دەچین؟". وتم: "بەدڵنیایی، بەڵام بۆ؟". وتی: " بۆیە دروست كراوین تا منالّ و نەوەمان هەبێت، تاوەكو نە رەگەزی مرۆڤ و نە رەگەزی مامبۆ لەناو نەچن، هەروەها بۆیە ئافرێنراوین تا هەندێ كاری هاوشێوە ئەنجام بدەین".

وتم: "چ كارێك؟".

ووتی: "من و تۆ پێویستمان بە خۆراكە، بێگومان دەبێ بخۆین تا گەشە بكەین، هەروەها تا لەش ساغ بین، تا رۆژێك بتوانین هێلكەیەك بكەین یا منالێكمان ببێت".

"بەڵام هەموو خۆراكێك بۆ ئێمە باش نییە، دەبێ سەرەتا تامی بكەین، كەوایە دەبێ من و تۆ زمانمان هەبێت"، میكا زمانی لەدەمی دەرێنا، پاشان هاواری كرد: "نابینی؟ ئەمە رووبەكە لە رووە لێكچوەكانمان".

کامێلا سەرنج دەدەی؟، ئەمە یەکێکە لە رووە لێکچوەکانمان، ئەگەر نا جیاوازی نێوان ئەوانەی پیتزا بە فراولە دەخۆن و ئەوانەی هێلکەی گەنیو دەخۆن چییە؟ ئەگەر نەتوانن تام بکەن؟ ئایا هەوڵتداوە ئەو جۆرە خۆراکانە بژمێری کە دەتوانی تامیان بکەی.؟

میکا پەنجەی نایە دەمی و دووبارە دەری کردەوە.

ووتی: "خۆراکە گەنیوەکان تام دەکەین، پاشان دەزانین ژەهراویە، بۆیە باشتر وایە بەر لەوەی شتەکان بخۆین باشتر وایە بۆنی بکەین، لێرەدا ژیانمان رزگار دەکەین".

وتم: "هەر بۆیە تۆ لوتت هەیە، وەك منیش لوتم هەیە، بەر لەوەی خۆراکەکان بخۆین دەتوانین بۆنی بکەین، زۆرێك لە ئاژەڵەکان خۆراك لە شوێنێکی دوورەوە بۆن دەکەن، یا بۆنی دوژمنەکانیان دەکەن بەر لەوەی پێیان بگەن، ئینجا ژیانی خۆیان رزگار دەکەن".

کامێلا هەستی بۆنکردن هەستێکی گرنگە، نابینی چۆن لە دوورەوە بۆنی شتەکان دەکەین؟، چەند رۆژێك لەوەوبەر لەوپەڕی باخچەکە لەلای درەختی ترێ کێویەکە بووم، لە پڕ لوتم پێی ووتم دایکم کێکی لە فڕنەکەدا دروستکردووە، دەستبەجێ گەڕامەوە بۆ ماڵ و خۆم کرد بە چێشتخانەکەدا و هاوارم کرد: کێك......... کێێێێێك".

بەڵام چۆن توانیم بۆنی ئەو کێکە بکەم کەبۆنەکەی لەهەموو شوێنێك بڵاوەی کردبوو، تەنانەت لای درەختی ترێ کێویەکەش گەیشتە لوتم؟، لوتم چۆن توانی بە مێشکم رابگەیەنێ کێکێك لە فڕنەکەدا ئامادەکراوە؟ نان نییە، یا کولێرە نییە؟.

لە میکام پرسی: "کێکت پێ خۆشە"؟، بەسەرسامیەوە ووتی: "کێك؟!". ئاشکرایە پێشتر کێکی نەبیستبوو، بۆیە درێژەی بە قسەکەیدا و ووتی: "حەزمان لە هەمان خۆراك نییە، هەروەها حەزمان لە هەمان بۆن نییە، بەڵام تەنها توانای بۆن و تام بەهەمان رادە بۆ ئێمە و ئێوە گرنگە".

میکا ماوەیەك بە کپی دانیشت، یاری بەو گژوگیایە دەکرد کە لە نێوان بەردەکانەوە سەریان دەرێنابوو، دەشێ دەستلێدانی پێ خۆشبووبێ و ختوکەی پەنجەی دابێ، وتم: "دەتوانین بە دەستلێدانیش شتەکان ئاشکرا بکەین، وا نییە؟". ووتی: "بەڵێ، راستە چونکە تۆڕێکی ورد لە دەوروبەری ئەو دەمارانە هەیە کە پێستی من و پێستی تۆی



داپۆشیوە، ئەگەر دەست لە شتێکی گەرم بدەین دەمانسوتێنێ، ئەگەر تیژ بێ بریندارمان دەکات، دەمارەکان ئاماژە دەنێرن بۆ مۆخ، لە ئاماژەیەکی بینین مۆخ بە پەیامێك فەرمانمان پێ دەکات لە مەترسیەك دوور بکەوینەوە".

بە پەلە دەستی لە گژوگیاکان دوور خستەوە: تا خێرایی مۆخم پیشان بدات چۆن پەیام دەنێرێ بۆ دەست.

پاشان ئاماژەی بە برینەکەی پەنجەی کرد و ووتی: "ئەگەر ئەو دەمارانەی سەرپەنجەم نەبوایە، ئەوە قولاپەکە دەچەقییە دەستمەوە و زیاتر ئازاری پێ دەگەیاندم".

بە پەلە تا بواری نەدەم پێش من قسە بەکات وتم: "من و تۆ پێویستمان بەوەیە دەست لە هەموو شتەکانی دەوروبەرمان بدەین، ئێمە هەردووکمان پێویستیی هاوشێوەمان هەیە، بۆیە ئەو ئامرازانەمان هەن کە پێداویستیەکانمان بۆ پڕ دەکەنەوە".

میکا بە شکۆوە سەری لەقاند و سەری بەرزکردەوە و سەیری کردم، ئینجا خەندەیەکی حەکیمانەی کرد ووتی: "ئێمە هەردووکمان حەز دەکەین یەکێك گەردنمان ختوکە بدات".

پاشان ئاماژەی بەو باڵندەی نەورەسەدا کە لەسەرسەرمانەوە دەفڕی، لێی پرسیم: "دەبینی، بۆچی ئەم باڵندەیە بەبەرزی دەقریوێنێ؟". وتم: "رەنگە بە یەکتر بڵێن لە کوێ خۆراك بدۆزینەوە؟".

سەری رەزامەندی لەقاند و وتی: "تایبەتمەندیە باشەکانی سەر هەسارەکەی من و هەسارەکەی تۆ ئەوەیە ئێمە دەنگ دەبیستین، ئەگەر مەترسیەك هەڕەشەمان لێ بکات، دەتوانین لە دوورەوە بیبستین تا خۆمان حەشار بدەین، یا بڕا بچوکەکانمان ئاگادار بکەینەوە کە سەرقاڵی یاریەکانیانن، کەوایە پێویستە دوو گوێمان هەبێت تا بەهۆیانەوە دەنگ ببیستین".

وتم: "دوو گوێ، چونکە یەك بەشمان ناکات".

میکا سەری لەقاند و ووتی: "وایە، چونکە ئەگەر یەك گوێچکەمان هەبێت، ئەوە سەرچاوەی دەنگەکە نازانین، ناشتوانین ئاراستەی مەترسیەکە دیاری بکەین، ئەمە شتێکی زۆر گرنگە، تا دەست نیشانی بکەین بە چ لایەکدا هەڵبێین".

تەماشای گوێچکەی میکام کرد زۆر بچوک بوون، کەمێك لە گوێچکەی من جیاوازبوو، تەنیا دوو کونی بچوك بوون لەملا و لەولای سەری".

ووتم: "ئەمەش یەکێك لە خاڵە لێکچوەکانی نێوانمان".

تاوێك بێ چرپە دانیشتین، گوێمان لە باڵندەی نەورەس گرت کە دەیانقریواند، ئینجا گوێمان لێبوو شەپۆلی دەریاکە خۆیان دەکێشا بە بەردەکاندا، پاشان ووتم: "هەردووکیشمان دەتوانین گوێمان لە دەنگی شەپۆلی دەریا بێت".

هەندێ رووەکی وشکانی هەیە، لە نێوان بەردەکان لەگەڵ گژو گیاکان گەشە دەکەن، میکا دەسکێکی لەو گژوگیایە هەڵکەند و لە چاوی نزیکی کردنەوە و وتی: "بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە، ئێمە دەتوانین هەموو جیهان لەشتەکانی دەوروبەرمان ببینین".

وتم: "چاومان هەیە شتی پێ دەبینین، ئێمە لەو شتەشدا لێك دەچین".

خۆر بەرەو ئاوابوون دەچو، میکا ئاماژەی بە بازنەیی خۆرکرد، بەهەمان شێوەی ئاماژەی بە خۆر کرد کاتێك بەیانی هەڵهات". ووتی: "ئێمە شتەکانی دەوروبەرمان دەبینین، تا بەدوای خۆراکەکانماندا بگەڕێین، هەروەها ئەو مەترسیانە ئاشکرا بکەین کە نزیکن لێمانەوە، بەراستی دڵڕفێنە، ئێمە دەتوانین یەکتر ببینین و گفتوگۆ بکەین، پرسیاری لە بارەی ئەو شتە بکەین کە بیری لێدەکەینەوە، لە ئاسمان ڕا بمێنین، پێکەوە خەون بە هەموو جۆرە جیاوازییەکانی ژیانی سەر هەسارەکانی ترەوە ببینین".

بیرم لەو شتە کردەوە کە میکا ووتی: "ئایا دڵڕفێن نییە لەسەر گردۆلکەیەك دابنیشم و تەماشای دەریا بکەم، تەنیا لەبەر ئەوەی دووچاوم هەیە شتیان پێ دەبینم؟، دوای ماوەیەکی درێژ بێدەنگی، میکا ووتی: "هێلکە شتێکی سەرسوڕهێنەر و پەرجوئاسایە".

پێشتر ئەمەی وتبوو، بەڵام درێژەی بەقسەکانیدا و ووتی: "لەناو هێلکە دووچاو دروست دەبن کە رۆژێك لە رۆژان دەتوانن ئەم گەردوونە فراوانە بپشکنن کە شوێنێکی زۆر کەمی تیا داگیر دەکەن، وەکو ئەوەی جیهان بەگشتی لە ناو ئەو هێلکە تاریکە گەشە بکات و گەورە ببێت".

بیرم لەمە کردەوە: "یا ناو سکی دایك".



میکا ووتی: "ئێمە لە زۆر رووەوە لە یەکتر دەچین، هەر یەکێك لە ئێمە دەتوانین تام بکەین و بۆن بکەین و دەست لێ بدەین و ببینین و ببیستین".

وتم: "ئاژەڵی دیکەی زۆر هەن ئەم هەستانەیان هەیە، بەڵام لە ئێمە ناچن"، وتی: "بەڵێ، من و تۆ پێویستمان بە چوار پێ نییە تا لەسەریان بڕۆین، لەسەردەمێکی زۆر کۆندا، ملیۆنان ساڵ لەمەوبەر، باوباپیرانی من و باوباپیرانی تۆ باڵایان راست بۆوە و لەسەر دوو پێ وەستاون، ئینجا هەردوو پێی پێشەوەیان پێشکەوت و گۆڕان بە قۆڵ و دەست".

ووتم: "بەڵێ، باوباپیرانی ئێمە —ئەو مرۆڤە سەرەتاییانەی لە دارستانەکان دەژیان- پێویستان بە دەست بوو تا لق و چڵی درەختەکان بگرن و بەروبوومی درختەکان بچننەوە، پاشان فێربوون بەدەستەکانیان بەرد بهاوێژن تا خۆیان لە ئاژەڵی دڕندە بپارێزن، دواجار دەستیان بۆ دروستکردنی کەل و پەل بەکارهێنا".

ئەم بابەتەم لەگەڵ باوکم تاوتوێ کردبوو، پێی وتم ئەو ئاژەڵانەی لەسەر چوار پێ دەڕۆن ناتوانن دوو پێی پێشەوەیان بەکاربهێنن بۆ ئەنجامدانی هیچ کارێك".

ووتم: "بەڵام بۆچی چوار پێ و چوار دەستمان نییە؟، یا سێ پێ و شەش دەست"؟!.

میکا چەمینەوەیەکی شانۆییانە چەمیەوە و ووتی: "چونکە ئێمە لەو ئاژەڵانەوە گەشەمان کردووە کە تەنیا چوار پێیان هەیە".

ئەم بابەتە هەمیشە سەرقاڵی کردووم، ئاژەڵە وشکایی ئاوییەکان تەنیا چوار پێیان هەیە، واتە بەسن بۆ ئەوەی بگۆڕێن بە دوو دەست و دوو پێ، بەڵام وەڵامەکەی میکا سەرسامییەکەمی تێر نەکرد.

سەیر نییە من و میکا لە ئاژەڵە چوار پێیەکانەوە گەشەمان کردووە؟، بۆچی لەو ئاژەڵانەوە گەشەمان نەکرد کە شەش پێیان هەیە یا هەشت پێیان هەیە؟.

میکا بیرکردنەوەی منی خوێندەوە، چونکە ووتی: "پێم وایە لێهاتوتر و بەتواناتر نەدەبووین ئەگەر چوار دەستمان هەبوایە لە بری دوو دەست، پێم وایە ئەوەی هەمانە بەسمانە و پێویست ناکات بەرپرسیارەتی دەست و پێی زیاتر هەڵگرین".

کامێلا تێ دەگەی میکا چیی وت؟ تا ئەمڕۆ سەرم سوڕدەمێنێ کاتێک بیر دەکەمەوە ئاژەڵە وشکاییی دەریاییەکان لەو کاتەی لە دەریاوە دەرچون لەسەر چوار پێ دەڕۆن، هەموو ئەو شتانەیان هەیە کە بۆ مرۆڤ پێویستن، نە زیاتر و نەکەمتر لەوەی مرۆڤ پێویستیەتی.

تەنانەت هەندێ جار دەپرسم، ئایا ئەو ئاژەڵە وشکاییی دەریاییانە چارەنووسی خۆیان دەزانن؟، میکا ووتی: "بەم شێوەیە رۆژێك لە رۆژان وەکو مامبۆکان یا مەمکدارەکان پشتیان راست بۆوە و لەسەر پێیەکانی پشتەوەیان وەستان و دەستەکانیان ئازاد بوو، پێشکەوتنی دەست زۆر پێویستە بۆ پەرەسەندن و پێشکەوتنی مێشك".

ووتم: "بۆ؟".

میکا چەمیەوە و ووتی: "باو و باپیرانی ئێمە دەستیان بەکارهێناوە بۆ دروستکردنی ئەو کەل و پەلانەی بۆ ژیانیان پێویست بووە، بەڵام بۆ ئەوەی دەستی ئەو پێشەسازیانە پێش بکەون پێویستە مێشك پێشبکەوێ و گەشە بکات. بەم شێوەیە ئەو ئاژەڵانەی لە بەکارهێنانی دەستیان پێشکەوتوون و لەو بوارەدا لێزانن، تایبەتمەندی زیاتریان بەدەست هێناوە لەو ئاژەڵانەی کە تا ئێستا دەستیان بەملاوبەولایاندا بێ کار شۆڕبۆتەوە".

ووتم: "بەو شێوەیە لێکچونی من و تۆ زیاتر دەبێت".

سەری لەقاند و ووتی: "بەڵێ، من و تۆ دەتوانین بیر بکەینەوە".

ووتم: "هەر بۆیە سەرمان گەورەیە".

میکا تاوێك بێ دەنگ بوو، پاشان تەماشای کردم و پرسیارێکی لێکردم، پێدەچو ئەو پرسیارەیە ماوەیەك بێ مێشکی سەرقاڵ کردبێ.

بۆیە ووتی: "لەو کاتەی براکەت لە سکی دایکت دێتە دەرەوە، سەری منالەکە ئازاری دایکت نادات". لێوم گەست و ووتم: "بەڵێ".

خۆم لە بیرکردنەوە لەو بابەتە بە دوور گرت.

ووتی: "هەموو هەسارەیەك تایبەتمەندی تایبەتی خۆی هەیە".

بەپەلە ووتم: "کارمەندەکانی نەخۆشخانە هاوکاری دەکەن".



پەنجەکانی کردەوە و ووتی: "منیش خەریکبوو هەمان شت بڵێم".

ووتم: "چی بڵێی؟".

ووتی: "بێگومان مرۆڤی وەکو من و تۆ هاوکاری یەکتر دەکەن، بۆیە گرنگە بتوانین گفتوگۆ بکەین، ئەگەر وا نەبێ هیچ کەسێك ناتوانێ لە هەسارەکەی خۆیەوە بڕوات بۆ هەسارەیەکی تر، ئەمەش روویەکی دیکەی لێکچونی نێوانمانە".

منیش ئەم شتەم بە مێشکدا هات.

**(ئەمە هەنگاوێکی بچوکە بۆ مرۆڤ،**
**بەڵام قەڵەمبازێکی مەزنە بۆ مرۆڤایەتی).**

ئەمە قسەی (ئارمسترۆنگ)ی ئاسمانگەڕە، کاتێك پێی نایە سەر رووی مانگ، وەکو ئەوەی بەم وشانە تەنیا خۆی نەچوبێتە سەر مانگ، بەڵکو وەکو ئەوەی هەموو مرۆڤایەتی لەگەڵ خۆی بردبێ.

میکا منگە منگێکی کرد: "هەنگاوێکی بچوکە بۆ مرۆڤ، بەڵام قەڵەمبازێکی مەزنە بۆ مرۆڤایەتی".

بە پەلە ووتم: "چۆن زانیت بیر لەم قسەیە دەکەمەوە؟؟!!".

میکا بە پەلە دەستی نایە سەر دەمی و هەستی بەشەرمەزاری کرد و ووتی: "ببورە".

دەمویست بزانم بە دروستی چیی روودەدا، میکا چۆن دەیتوانی شتێك بڵێ کە من بیرم لێی دەکردەوە، دڵنیابووم هەرگیز لەگەڵ میکادا بابەتی چونی مرۆڤم بۆ سەر مانگ باس نەکردبوو، بە دڵنیاییەوە میکاش لەسەر مانگ نەبووە کاتێك ئارمسترۆنگ ئەم قسەیەی کردوە.

ووتم: "بۆچی داوای لێبوردن دەکەی".

بەدان پێدانانەوە ووتی: "چونکە شتێکم ووت کە تۆ بیرت لێی دەکردەوە، ئەوەش مشەخۆری بوو لەلایەن منەوە. بەڵام بیرکردنەوەکانت زۆر سەرنجراکێشن، لەگەڵ بیرکردنەوەکانت تێك ئالام و خۆم لە بیرکرد".

پاشان پێی ووتم لەسەر هەسارەی ئیلیۆ مامبۆکان راهاتوون بیری یەکتر دەخوێننەوە، زۆریان گفتوگۆی دوورودرێژ ئەنجام دەدەن بەبێ ئەوەی یەك ووشەش بڵێن.

میکا ووتی: "بیر خوێندنەوە توانایەکی زۆر بەکەڵك و بەسوودە، من تەنیا چەند کاتژمێرێکی کەم لەسەر هەسارەکەی ئێوە بووم، چۆن توانیم بە زمانەکەی ئێوە قسە بکەم؟ چۆن ئەم هەموو زانیارییەم لەبارەی هەسارەکەی ئێوە زانی؟ تەنها لەبەر ئەوەی بیرکردنەوەی تۆم خوێندەوە.، ووتم: "ئێمە لەم رووەوە لە ئێوە ناچین، ئێمە ناتوانین بیرکردنەوەی یەکتر بخوێنینەوە".

به نەرمی وەڵامی دایەوە: "بەڵام ئێوە دەتوانن شتی تر بکەن کە ئێمە ناتوانین ئەنجامیان بدەین".

هەوڵمدا بیر لە کارێکی تایبەت بکەمەوە کە بتوانم ئەنجامی بدەم، یەکسەر ترسانی میکام لە زەنگی تەلەفۆنەکە بە یاد هاتەوە.

بۆیە ووتم: "ئێمە تەلەفۆنمان هەیە، ئامێرێکە دەتوانین بەهۆیەوە قسە لەگەڵ ئەو کەسانە بکەین کە لە ناوچەیەکی دیکەی زەوی دەژین، هەسارەکەمان بریتیە لە تۆڕێکی تەلی تەلەفۆن کە بەهۆیەوە پەیوەندی بە یەکترەوە دەکەین".

میکا بە ئیرەییەوە ووتی: "هەموو هەسارەیەك تایبەتمەندی خۆی هەیە"، چاوت لێبوو چی رویدا کامێلا؟، کاتێك بۆم دەرکەوت میکا توانای خوێندنەوەی بیرکردنەوەی منی هەیە، زارەترەك بووم.(*).

پێم وابێ ئەویش حەپەسا کاتێك باسی تەلەفۆنم بۆ کرد، بیهێنە پێش چاوی خۆت چی بەسەر دەهات ئەگەر باسی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێتم بۆ بکردایە".

یا بەو شێوەیە دواجار بۆم دەرکەوت میکا چۆن دەتوانێ بەزمانەکەی من قسە بکات، بۆچی ئاسان بوو قسە لەسەر ژیانی سەر زەوی بکەین، چونکە بیرکردنەوەکانی منی دەخواست و قسەی پێ دەکرد، بەڵام تا ئێستاش لەو لێکچونە سەیرەی نێوانمان سەرم سوڕمابوو، لەو کاتیدا میکا لەبارەی چیاوە قسەی بۆ کردم.

---

(*) زارەترك: زۆر ترسان، تۆقین (و.ك).



میکا چاوی بە چواردەوری خۆیدا گێرا و نیگایەکی فراوانی دیمەنەکەی دەوروبەری کرد و پاشان بە ویقار و لەسەرەخۆ دەستی خستە سەر ئەو کۆمەڵە بەردەی کە من و باوکم کەڵەکەمان کردبوو.

ووتی: "ئەگەر تۆ لە دۆڵێکدا بژیبای و منیش لە دۆڵێکی تر بژیبام، ئایا ئەگەری ئەوەی نەبوو هەر یەکێك لە ئێمە بۆ سەرەوەی دۆڵەکەی هەڵزنایە و رۆژێگ بگەیشتایەتە سەر لوتکەی چیا و دەستی یەکترمان بگرتبا؟".

ئەوە پرسیاربوو، بۆیە هەر ئەوکات بۆی چەمیمەوە، بەڵام لە ماناکەی تێ نەگەیشتم، میکا درێژەی بە قسەکانیدا و ووتی: "دەشێ رێگای زۆر هەبێت بۆ سەرکەوتن لە دۆڵەکەوە بۆ سەر چیاکە، بەڵام چیاکە هەر هەمان چیایە، هەرگیز ناگۆڕێ، بێگومان دەبێ لێکچونی زۆر لە نێوانماندا هەبێت تا بتوانین بگەینە لوتکەی چیاکە، بۆ نموونە دەبێ هەردووکمان هەڵزنەری چیا بین، لەسەر لوتکەکەش بەبەرد باڵەخانەیەکی مەزن بونیاد بنێین، پاشان لەسەری دابنیشین تا کەمێك پشوو بدەین دوای ئەو هەوڵەی بەخشیومانە. هەروەها بۆ تاوێکی کورتیش بێت هەموو خەمەکان لە بیر بکەین، ورد و درشتیان. وەکو ئەوەی هەموو خەمەکانمان لە دۆڵەکە لەدوای خۆمان بەجێ هێشتبێ".

ووتم: "ئایا مەبەستت ئەوەیە لەسەر هەمان چیا بەیەکتر گەیشتووین، گەرچی من لە هەسارەیەکی دیکەوە هاتووم و تۆش لە هەسارەیەکی ترەوە هاتووی؟".

سەری رەزامەندی لەقاند و ووتی: "ئەو شوێنەی لێوەی هاتووین گرنگ نییە، ئەوەی گرنگە ئەو ئامانجەیە کە هەوڵی بۆ دەدەین، ژیان و گەشەکردنی پێشترمان جیاوازە، من لە مامبۆم و تۆش لە مەمکدارەکان، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات لێکچونی نێوانمان زیاتر دەبێت".

هەستم بە جۆرێك لە ترس کرد، ئێمە باسمان لە بابەتگەلێکی زۆر ئەستەم و ئاڵۆز کرد میکا ووتی: "لەسەر هەسارەکەی من و لەسەر هەسارەکەی تۆ ژیان لە خانەیەکی سادەوە دەستی پێکردووە، پێم وا نییە سەرەتایەکی دیکە هەبێت، هەرچەندە ژیان پێش بکەوێت ژیان هەمەجۆر دەبێت، پاشان هەستەکانی هەندێ بونەوەر گەشە دەکەن و کۆئەندامی دەمارەکانیشان پێش دەکەوێ، تەنانەت مرۆڤ بووە خاوەنی ئەقڵێك کە وای لە

مرۆڤ کرد ببێته پێشکەوتوترین بونەوەر، چونکە مرۆڤ بەهۆی ئەقڵەوە لە جیهانی دەوروبەری تێدەگات. ئایا ئاراستەیەکی دیکەی پێشکەوتن پێشبینی دەکەی؟".

بۆ ئەم پرسیارە چەمیمەوە، بەڵام هیچ وەڵامێکم بۆی نەبوو.

ووتی: "ژیان لە قوڵایی دەریاکانەوە دەستی پێکرد، لەسەرەتادا لەسەر زەوی تەنیا ئاو هەبوو، پاشان ئا ئەوە ئێمە لێرە دانیشتوین و تەماشای کەناری دەریا دەکەین، ڕەنگە ئەم ئەنجامە لەسەرەتادا ئامانج بوویێت".

میکا کەمێك چاوی بڕیە دەریاکە، پاشان ووتی: "هەسارە لەسەر سەرین راکشابوو، پاشان وردە وردە ژیان تیایدا جوڵا، ئینجا دەریا شڵەژا و شەپۆلەکان خرۆشان و گژوگیاکان لەرینەوە و باڵندەش لەسەر ئاو لە شەقەی باڵی دا. بەو شێوەیە ژیان هەموو زەوی تەنییەوە".

" بەڵام تا ئێستا ژیان لەسەر زەوی بە تەواوی بەئاگا نەهاتووە، کاتێك ئێوەم ناسی ئێوە دانیشتوانی ئەم هەسارەیە بوون، بەشێك بوون لە مێژووەکەی، گەیشتنە سەر مانگ، ئەو خاڵە جادووییەشتان دۆزییەوە کە تیایدا سەرەوە دەبێت بە خوارەوە و خوارەوەش دەبێت بەسەرەوە، زیاتر لەمەش چاوتان خستە سەر سەرتاپای گەردوون".

بەترسەوە ووتم: "بەڵێ، ئەمانە بەراستی روویاندا". نەمزانی بڵێم چی، لەکاتیشدا خەریکبوو دەگەیشتینە سەر لوتکەی چیاکە، ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگ بوو خودی چیاکە بوو نەك ڕێگای سەرکەوتنە دوور و تاقەتبڕەکەی.

دواجار ووتم: "دەشێ هەستی دیکە هەبن، تا ئێستا بەدەستمان نەهێنابن".

میکا ووتی: "بەڵێ، دەشێ وابێ، ئەوە ئێستا لەسەر ئەم هەسارەیە دانیشتوین، لەم بۆشاییە فراوانە، لەبارەی گەردوونەوە بیر دەکەینەوە و قسە دەکەین، بریا هەستێکی ترم ببوایە و بۆنم بکردایە و ببینیبا ژیان لەم گەردوون چۆن دەستی پیکردووە".

دیارە بۆ ئەم ووشە حەکیمانە نەچەمیمەوە کە زەفەریان بە دڵم برد بوو، بەڵام ئەزبەرم کردن.

میکا بەردێکی لە زەوی هەڵگرت و ووتی: "ئەمە چییە؟".



پێم وابوو ئەوە پرسیارێکی سادەیە، بۆیە ووتم: "ئەوە پارچە بەردێکی ئەستێیە، یا پارچە گرانیتێکی ئاساییە".

میکا بە پەستییەوە ووتی: "لەم گەردوونەدا هیچ شتێکی ئاسایی نییە، چونکە هەموو شتێك لەم گەردوونە بەشێکە لە نهێنی بوون، تەنانەت من و تۆش بەشێکین لەو مەتەڵە، بەڵام ئێمە ئەو مەتەڵەین کە ناکرێ کۆدەکەی بدۆزرێتەوە".

میکا بەردەکەی بەرزکردەوە و لەمنی نزیك کردەوە تا بەروونی ببینم، ئینجا ووتی: "ئەم بەردە لە کوێوە هاتووە؟ دەزانم بەشێکی بچوکە لەم هەسارەیە، ئەم هەسارەیەش بەشێکی بچوکی گەردوونە، بەڵام گەردوون چییە؟، لە کوێوە هاتووە؟".

هیچ وەڵامێکم بۆ ئەو پرسیارە نەبوو، نەشم وێرا سەرکێشی بکەم لە خەملاندنی وەڵامی مەزنترین نهێنی ئەم گەردوونە.

میکا بەردەکەی خستە سەر ئەو کەڵەکە بەردەی کە لەگەڵ باوکم کۆمەڵمان کردبوون، لەدڵی خۆمدا ووتم: "میکاش بەشداری کرد لە بونیادنانی ئەم کەڵەکە بەردە".
پاشان لێم پرسی: "ئایا پێت وایە بونەوەرەکان لەخۆیانەوە دروست بوون؟، یاخودا هەموو شتێکی دروستکردووە؟".

میکا ووتی: "پێم وا نییە دیناسۆر و باوباپیرانی مامبۆکان ئەم پرسیارەیان کردبێ".
پێکەنیم و ووتم: "بەڵام ئێمە دەیکەین، سەرقاڵبوون بە پرسیارە سەختەکان ڕوویەکی دیکەی لێکچوونمانە"، ئەویش بزەیەکی کرد و ووتی: "بەڵێ، ئەم پرس و ڕایانە گرنگترین رووی لێکچوی نێوانمانن".

پاشان پرسیارێکی لێکردم کە هەرگیز لە یادی ناکەم، ووتی: "ئەگەر ئەم گەردوونە خودایەکی نەبوایە، گەردوون خۆی چۆن دەبوو وەکو ئێستا دەیبینین؟"، زۆر بیرم لەم بابەتە کردەوە: "گەردوون چییە؟، چۆن ئاوای لێهات کە دەیبینین؟، لە کوێوە دەستی پێکرد؟، لە کوێ کۆتایی دی؟"، پاشان پرسیم: "ئەی تۆ چۆنی دەبینی"؟.

میکا زۆر بە توندی چەمیەوە و ووتی: "پێم وا نییە ئەم گەردوونە زۆر کۆن و ئەزەلی بێت". پاشان چاوانی بریسکانەوە و ووتی: "هەسارەکەی ئێوە بەهێزی کێشکردن

بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە، دەریاش بەهێزی کێشکردن جوڵەی هەڵکشان و داکشان ئەنجام دەدات، بێگومان هێزێکی بەهێزتر لەهەموو شتەکان هەیە، کە تۆی لە دەریاوە دەرکێشاوە و وای لێکردووی دووچاوت هەبێ، پێیان ببینی و ئەقڵێکت هەبێ بیری پێ بکەیتەوە". بێ دەنگ بووم نەمدەزانی بڵێم چی.

پاشان ووتم: "پێم وایە ئەوەی بڕوای بە ئافرێنەری ئەم گەردوونە نییە، هەستێك لە هەستەکانی لەدەستداوە، هەستێکی زۆر گرنگیش".



# شەو

خۆر خەریکبوو لە پشت بەردەکانەوە ئاوا دەبوو، لە پڕ بەرزتر لە دەنگی نەورەسەکە گوێمان لە دەنگێکی تیژبوو. دەیوت: "چو تۆ لە کوێی؟".

پورە هێلین بوو لە باخچەکە بەدوای مندا دەگەڕا، ئەگەر بەرەو تۆپلکەکە سەری بەرز بکردایە یەکسەر میکای لەگەڵ من دەبینی، ئەو دەیزانی جاروباری من لەوێ دادەنیشم.

بەمیکام وت: "بێگومان دەبێ ئێستا بگەڕێمەوە، کاتی نوستنم نزیك بۆتەوە". هەستامە سەر پێ و ڕۆیشتم، گوێم لێبوو میکا لە دوامەوە دەڵێ: "ئێستا کاتی بێداربوونەوەمە".

لەسەر ڕێڕەوی باخچەکە پورمم بینی، پێی وتم باوکت جارێکی تر پەیوەندی کرۆدتەوە و وتویەتی، هێشتا منالەکە لەدایك نەبووە، پورم وتی دەبێ ئێستا نانی ئێوارە بخۆیت و بخەویت.

دانیشتم بۆ ئەوەی نانی ئێوارە بخۆم، بیرم لە میکا کردەوە کە بە پەلە بە جێم هێشت بوو، ئەبێ ئێستا لە کوێ بێ؟، ئایا دەتوانێ ئاگای لەخۆی بێ؟، مەبەستی چی بوو لەوەی وتی ئێستا کاتی بەخەبەرهاتنمە.

چومە سەر نوێنەکەم، شەوشادم لە پورم کرد، گڵۆپەکەم کوژاندەوە، دابەزیم بۆ ئەوەی لەسەر سیسەمەکەی نهۆمی خوارەوە بنوم.

بەر لەوەی لە ژوورەکەم بەجێ بهێڵێ دوایین شت کە پورم پێی وتم: "چو بێنە پێش چاوی خۆت، کاتێك هەڵدەستیت خوشکەکەت یا براکەت هاتوەتە دونیاوە". بیرم لە برا بچوکەکەم کردەوە، بەخۆمم وت: "ئەوەی باشە ئەمڕۆ زۆر قسەم لەسەر زەویەکەمان و جیهانی دەوروبەرمان کرد، چونکە بەرپرسم لەوەی براکەم فێری هەموو ئەو شتانە بکەم کە لەبارەی دروستبوونی گەردوون و سەرەتای ژیان دەیزانم". بێگومان کەمێك بێ

ئاگابووم، چونکە لە تپە تپەی پەنجەرەکـە بـە ئاگاهـاتم، میکـا بـوو، دوای ئـەوەی لـە باخچەکە بەجێم هێشت بوو سەرکەوتبووە سەر بانی خانووەکە.

لە ناو نوێنەکەم هەڵسام، پەنجەرەکەم کـردەوە و پـێم وت: "وس". بـە چـرپە وتـی: "حەز دەکەی لەگەڵم بێیتە سەربان بۆ ئەوەی تەماشای ئەستێرەکان بکـەین؟". کـەمێك دوو دڵ بووم، ترسام لەوەی پورم بێتەوە بۆ ژوورەکـە، پاشـان جلـەکانم لەبـەر کـرد و لـە پەنجەرەکەوە دەرچوم و لەگەڵ میکا چومە سـەر لێـوارە لێژەکـە، تـا گەیـشتینە سـەری سەرەوە. شەو زۆر روون و بێگەردبوو، ئەستێرەکان دەدرەوشانەوە، هەوا سارد بوو، لـەپاڵ یەکتر دانیشتین بۆ ئەوەی گەرم ببینەوە. میکا ئاماژەی بـە ئەسـتێرەیەکی گـەش کـرد، لەوانی تر گەشتر و پرشنگدارتر بوو. بە شکۆوە ووتـی: "رەنگـە ئـەو ئەسـتێرەیەی کـە کەوتووەتە سەرووی ئێمەوە ئەوە خۆری هەسارەی ئیلیۆ بێت".

وتم: "رەنگە ئەو ئەستێرەیەی خوارمانەوە بێت نەك ئەوەی سـەرووومانەوە، ئـەی لـە بیرت چو تۆ بەرەو سەرەوە گەشتت کرد تا سەرت کێشای بەم هەسارەیەدا؟".

من تا ئەوکات سەرقاڵی ئەو بیرۆکەیە بووم کە رۆژێك لـە رۆژان لـە نـاو هێلکەیەکـەوە دەرچوە، لێم پرسی: "لە کەیەوە لە ناو هێلکەوە هاتیتە ناو ژیان لەسەر هەسارەی ئیلیۆ؟".

میکا بۆ پرسیارەکەم چەمیەوە و وتی: " ماوەی ساڵێکە رێك".

پێم وت:"سەری ساڵت پیرۆز".

پاشان وتم: "من هەشت ساڵە لەدایکبووم، من زۆر لەتۆ گەورەترم".

ووتی: "بەڵام ساڵی سەر هەسارەی ئیلیۆ زۆر لە ساڵی سەر هەسارەی زەوی درێژترە، ساڵ بە گوێرەی خێرایی سورانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا دیاری دەکرێت".

بەپەلـە ووتم: "خولانـەوەی زەوی بـە دەوری خـۆردا ٣٦٥ رۆژ و چـارەکە رۆژێکـی دەوێت، بۆیە هەر چوار ساڵ جارێك رۆژێك بۆ ساڵ زیاد دەبێ، تا ساڵنامەکە تەواو بێت.

دیارە دەشزانم ساڵ لێرە لە ساڵی هەسارەیەکی دیکە رەنگە درێژتر یا کورتتر بێت".

میکا ووتی: "رۆژی ئێمە زۆر لە رۆژی ئێوە درێژترە، ئەوەتا لای ئێوە خـۆر تاوێکـە هەڵهاتوووە،کە چی ئەوەتا وا دیسان شەو هات".



بۆم شیکردەوە: "چونکە زەوی لە یەك رۆژدا بەدەوری خۆیـدا دەخولێتـەوە، رۆژیـش بیست و چوار کاتژمێرە".

میکا پرسی: "کاتژمێر چییە؟".

بۆم دەرکەوت بیرۆکەی بیست و چـوار کاتـژمێر راسـتیەکی زانـستی نییـە، بـەڵکو بیرۆکەیەکە بۆ دابەشکردنی رۆژ دامانهێناوە. بۆ نموونە دەمانتوانی رۆژ دابەشی سـەر دە کاتژمێر بکەین، ئەوکات کاتژمێر لەکاتژمێری ئێستا درێژ تر دەبوو، یا لە بـری ئـەوەی کاتژمێر دابەشی سەر شەست دەقیقە بکەین دابەشی سەر سەد دەقیقەمان دەکرد.

بە میکام ووت: "ئێمە رۆژمان دابەشی سەر بیست و چوار کاتژمێر کـردووە، لـە هـەر کاتژمێریکدا شەست دەقیقە هەیە، ئینجا دەقیقەشمان دابەشی سەر شەست چرکە کردووە".

میکا ووتی: "ئێستا تێگەیشتم، بەڵام درێژی چرکە چەندە؟".

بە هێواشی دەستم کرد بە ژماردن:"یەك... دوو... سێ...".  بۆم روونکـردەوە لـە نێوان وتنی هەر ژمارەیەك چرکەیەکە.

میکا بیری کردەوە و پەنجەکانی دەژمارد، وەکو ئەوەی بیەوێ شتێ هەڵێنجێنێ.

پاشان ووتی: "کەوایە بەگوێرەی سەر هەسارەکەی من تۆ تەمەنت سـاڵێك و هەشـت رۆژە". بە گوێرەی لێکدانەوەکان بۆم دەرکـەوت مـن هەشـت رۆژ لـە میکـا گـەورەترم، ئەمەشم زۆر بەلاوە گـرنگ بـوو، ئەسـتێرەکان لـە ئاسمـان وەکـو دەرزییـەکی بریقـەدار دەتروسکانەوە، لە میکام پرسی: "بۆچی هاتی بۆ ئێرە؟".

ووتی: "بۆ ئەوەی چاوم بە تۆ بکەویّ! پێت وایە ئەوەی کەوتمە باخچەکەی ئێوەوە و تۆش بە تەنیا لەماڵەوە چاوەڕوانی لە دایکبونی برا بچوکەکەت بووی، تەنها رێکەوتێك بێت؟!".

ئەم پرسیارەم بە شتێکی تایبەت زانی و بۆی چەمیمەوە. بەڵام تائێستا هەندێ بەشی تەمومژاوی لەم چیرۆکەدا هەن. میکا وتی: "بەڵام ئەمانە هەمووی تەنها خەونن".

وتم: "مەبەست چییە  لە هەموو ئەم شتانە"؟.

پەنجەکانی بڵاو کردەوە ووتی: "خەونم بـینی بـە کەشـتیە ئاسمانیەکـەم بـە ئاسمانـدا دەگـەڕام، سـاڵانێکی زۆرم تێپەڕانـدبوو تـەنها ئەسـتێرە و گەلـە هەسـارەم دەبـینی،

جاروباریش ئەستێرەیەك دەكشا، رۆژێك گەیشتمە سەر كۆمەڵەیەكی خۆر، سەرەتا بە لێواری كۆمەڵەكەدا بە هەسارەیەكی سارددا تێپەڕیم، پاشان بەلای هەندێ هەسارەی گەورەی دیكەدا تێپەڕبووم كە مانگ و بازنەی گەورەیان هەبوو". لە پڕ لە دوورەوە مرواریەكی بچوكم بینی، رەنگی لەنێوان شین و سەوزدا بوو، هەر لە كوللەیەكی بچوك دەچو، لە خۆمم پرسی: "ئایا دەبێ ژیانی تێدا هەبێ.؟..".

به پەلە ووتم: "ئەوە زەوی بوو، كەوایە ئەوە خەون نیە".

به ناقایلبوونەوە سەری لەقاند: و وتی:"بەلاّم من دڵنیام ئەمە خەونە، منیش زۆر فزوڵیم (واتە حەزی شت زانینم هەیە)، بۆیە كونەكەم كردەوە، لە ناو تاریكیدا هاوارم كرد: سلاّو، كەس لێرەیە؟، یا هەسارەیەكی چۆڵە و ژیانی لەسەر نییە؟".

بیرم لەوە كردەوە كە میكا ووتی. ووتی:" لە پڕ لە كونەكەوە كەوتم و بەخێراییەكی سەیر بەرەو سەر رووی ئەم هەسارە نامۆیە خلۆر بوومەوە، هاوارم كرد: فریام بكەون، رزگارم بكەن، گەرچی دەمزانی كەسیش نییە رزگارم بكا، هەر هاوارم دەكرد: فریام كەون، بەربوومەوە".

به تاسەوە وتم: "بێگومان زۆر ترسای".

میكا سەری لەقاند و ووتی: "لە پڕ خۆم بینیەوە كە بە درەختێكی سێوەوە هەڵواسراوم، نەگەیشتمە سەر زەوی، باقی چیرۆكەكەش خۆت دەیزانی".

بەڵێ... بە دار سێوەكەوە شۆڕ بووبوە، بەچاوی خۆم بینیم

میكا ووتی: "من دەمزانی بەدرێژایی كاتەكە خەون دەبینم، گەرچی ئەو خەونە هەر درێژەی هەیە". وتم: "رەنگە خەونیشت بینیبێ كە لە هێلكەكە دەرچوی". بە نەخێر سەری لەقاند و ووتی: "من دڵنیام لەوە، هەر وەك چۆن دڵنیام لەوەی من و تۆ لەسەربانی خانوەكەی ئێوە دانیشتووین و چاومان بڕیوەتە ئاسمان".

وتم: "بەلاّم، ئەگەر گەشتت بۆ سەر ئەم هەسارەیە تەنیا خەون بێ، كەوایە دانیشتنی من و تۆ لەم سەر بانە بەم شەوە تەنها خەونە، ئەگەر وایشە ئەوە بێگومان یەكێكمان خەون دەبینین".



میكا سەری لەقاند و ووتی: "هەر هەسارەیەك دوو رووی هەیە، ناكرێ هەردوو لای هەسارەكە لە یەك كاتدا خۆریان لێ هەڵبێ، خەونیش هەر وایە، یەكێكمان خەون دەبینین و ئەوی تریش لە خەونەكەدا هەین، ناكرێ لە یەك كاتدا خەون بینین و بەخەبەریش بین".

وتم: "كەوایە كێمان خەون دەبینین و كێمان لەو خەونەكەداین؟".

به دەست بادانەوە ووتی: "جیاوازی لە نێوان هەردوو دۆخەكەدا نییە، گرنگ ئەوەیە ئێمە لەسەر لوتكەی ئەو چیایە یەكترمان بینی، بەدەگمەن خەڵكی لەسەر لوتكە یەكتر دەبینن".

وتم: "بەلاّم ئەگەر من خەون ببینم، ئەوە بێگومان تۆ هەبوویت بەر لەوەی من خەونەكەم ببینم، هەر كاتێكیش من لە خەو هەڵسم لەو كاتەدا تۆ وون دەبی".

ووتی: "كێ چوزانێ تۆ تاكە كەس بیت خەون بە منەوە ببینی؟، كێش چوزانێ تۆ جارێكی تر خەون بەمنەوە نابینی؟".

ئەو پرسیارە بۆ من وەكو بروسك بوو، هەوڵم نەدا بەدوای وەلاّمدا بگەڕێم بۆی، تەنیا سەرم بۆ لەقاند، قسەكانی میكا مانایەكی تازەی دا بە هەموو ئەو شتانەی كە پێشتر قسەمان لەبارەوە كرد.

لەوكاتیدا زانیم لەسەرما هەڵدەلەرزم، خەریكبوو دەڕچیم، بەلاّم سووربووم لەسەر ئەوەی لە میكا جیا نەبمەوە. وتم: "بیرۆكەیەكم هەیە".

نیگایەكی سەیری كردم، نیگاكە خاڵی بوو لە مانا. دەترسام میكا بەخەبەر بێت و لەپڕ لەبەر چاوم وون بێ، ویستم لە بیرۆكەكەمدا بەشدار بێت. ووتم: "رات چییە ئەمشەو لەژێر نوێنەكەم پێكەوە بنوین؟".

میكا دڵخۆشبوو بە داواتەكەم بەوەی شەو لە ژوورەكەم بەسەر ببا، دیارە رەفتاری نەرم و نیان و رەچاوكردنی هەست و سۆزی ئەوانی تر شتێكی باو و باشە لە هەموو گەردوون.

ووتی: "لانی كەم، لەگەڵت دێم بۆ ژوورەكەت".

پێكەوە لە پەنجەرەكەوە چوینە ژوورەكەم، میكا لە ژوورەكە رامابوو وەكو ئەوەی یەكەمجار و دوایین جاری بێت ئەو ژوورە ببینێ.

پاشان وتی: "شتێكی خۆشە مرۆڤ لە ماڵێكی وا جواندا بژیت، شتێكی دڵرفێنیشە مرۆڤ برایەكی بچوكی هەبێ".

لەسەر نوێنەکەم پەتوویەکی زیاد هەبوو، تا شەوە ساردەکان بەخۆمی دادەم، لە ژێر سیسەمەکەم راخست.

ووتم: " لێرە بنوو، بەڵام پەیمانم پێ بدە بێ دەنگ بیت ئەگەر پورە هێلین هات".

میکا هەڵسا و گۆی زەوییە هەڵسوارراوەکەی خولاندەوە، پاشان کە گۆی زەوییەکەی زیاتر دەخولاندەوە ووتی: "هیچ دەنگە دەنگێك ناکەم".

وتم: "ئایا دەزانی دوانزە کاتژمێر پتر بەسەر یەکتر بینینماندا تێپەڕیوە؟".

ووتی: "رەنگە تەنها چەند دەقیقەیەك بێت".

ووتم: " سەبارەت بەمن کاتژمێر درێژە، کاتێکیش بەیانی هەڵدەستین، رۆژێکی تەواو تێپەڕیوە".

میکا بە پەنجەی گۆی زەوییەکەی وەستاند، پاشان تەماشای کردم و بە پەرۆشیەوە ووتی: "گەشت بە چواردەوری جیهاندا دەتگێڕێ، بەڵام خەون دەتبا بۆ ناو جیهان، بەڵام ناتوانین لە یەك کاتدا گەشت بۆ چەند لایەك بکەین".

تا ئێستاش ئەو وشانەم لە بیرە و تا هەنوکەش ئاسمانی دەرەوە سەرنج راکێشە بەلامەوە، وەلێ ئەوەی زیاتر سەرسامم دەکات ئەوەیە ئەقڵێکم هەیە دەتوانێ بەرەو جیهانێکی تایبەتم ببات..

میکا خۆی خزاندە ژێر قەرەوێڵەکە و لەسەر پەتووەکە پاڵکەوت، پێم وت: "شەوت شاد".

وتی: "یا بەیانیت باش، چونکە زەوی بەدەوری خۆی و بەدەوری خۆیدا ئەخولێتەوە".

سەرم نایە سەر سەرینەکە، لە پڕ گوێم لە دەنگی میکا بوو چرپاندی بە گوێمدا: "ملیۆنان ساڵ تێپەڕ دەبێ ئینجا بوونەوەرێکی وەکو ئێمە پەیدا دەبێ، بونەوەرێك بیر بکاتەوە و خەون ببینێ، بیر بکاتەوە و لە بیری بچێتەوە، جیهان هەمووی لە خزمەتی ئێمەدایە".

ئەمە دوایین وشە بوو میکای پێی وتم، پاشان خۆی خزاندەوە ژێر قەرەوێڵەکە، ئینجا هەردووکمان نوستین.



# کڵاو

پاش تاوێك پورە هێلین هاتە ژوورەوە، هەستام پێم وابوو شەو زۆر خێرا تێپەڕیوە، پورم لە قەرەوێڵەکەم نزیك بووەوە، ترسام میکا دەست لە پێی بدا یا ختوکەی بدا، بە دڵخۆشییەوە ووتی: "هەستە چوە"، پاشان لەلێواری قەرەوێڵەکەم دانیشت و پرچی داهێنام. دیسان ووتی: "چو هەڵسە"، باوکت لە نەخۆشخانەوە پەیوەندی کرد و وتی برا بچوکەکەت لەدایکبووە". لەوکاتیدا بەتەواوی خەبەرم بووەوە، دواجار دوای ماوەیەکی درێژ برا بچوکەکەم گەیشت، وتم:"دڵنیابووم کە برام دەبێ". پورە هێلین ووتی هێلکەم بۆ لێناوی و باوکیشت بەم نزیکانە دەگاتەوە ماڵ و تۆ دەبا بۆ نەخۆشخانە تا برا بچوکەکەت لە نەخۆشخانە ببینی.

پورم لە ژوورەکە چوە دەرەوە، چەمیمەوە و تەماشای ژێر قەرەوێڵەکەم کرد و ووتم: "وس".

بەڵام کەسم نەبینی، بینیم پەتووەکەی میکا لە تەك نوێنەکەم دەق کراوە.

لەو کاتیدا وام بە مێشکدا هات کە میکا لە خەوکەی خەبەری بوەتەوە بۆیە لە ژێر قەرەوێڵەکە نییە، هیوام خواست بەر لەوەی بە تەواوی خەبەری بووبێتەوە گەیشتبێتە هەسارەی ئیلیۆ، ئەی ئەگەر نەگەڕابێتەوە بۆ هەسارەکەی ئەی ئێستا لە کوێیە؟.

هەروەها کەروێشکە سپیەکەشم دیار نەبوو، بەر لەوەی چاوم بە میکا بکەوێ ئەو کەروێشکە هاوڕێیەکی دڵسۆز و تەنهای من بوو، هەموو شوێنێکی بە دوادا گەڕام بەڵام نەم دۆزیەوە. بە خۆمم وت: "ئەگەر میکا لەگەڵ خۆی بردبێتی تا تەنیایی خۆی پێ پڕ بکاتەوە یا لەو گەشتە دووردرێژەیدا یاری لەگەڵ بکات، ئەوە نیگەران نیم، بەتایبەت ئێستا برایەکی بچوکم هەیە". دەست و دەماوچاوم شوشت و دابەزیمە چێشتخانەکەوە،

بینیم پورە هێلین خوانی بەیانی ئامادە کردووە، ماوەیەکی درێژ دوو دڵ بووم لەوەی داوای لێبکەم هێلکەکەی من پاك بکات.

دوای نانی بەیانی گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم تا بە میکانۆکانم یاری بکەم، بەڵام گوێم لە دەنگی ئۆتۆمۆبێلەکەمان بوو، دەستبەجێ من و پورم چوین بۆ دەرگای پێشەوە، بینیمان باوکم دەست بە زەنگەکەوە دەنێ، میکام بیر کەوتەوە، ئەوەشم بیر کەوتەوە کە چۆن لە ترسی زەنگی دەرگاکە قیژاندی، بە خۆمم وت: "بێگومان ئێستا کۆمەڵەی خۆری بەجێهێشتووە". باوکم لە باوەشی کردم و لەزەوی بەرزی کردمەوە و ئینجا ووتی: "برایەکی جوانت بوو چو، جلەکانم دەگۆڕم و ددانەکانم دەشۆم، پاشان دەتبەم بۆ نەخۆشخانە تا برا تازەکەت ببینی و سەردانی دایکیشت بکەی". لە پڕ بینیم دەگریم، گریام و هەر گریام، تا باوکیشم لەگەڵ من دای لە قوڵپی گریان. تا ئەمڕۆش هۆکاری گریانەکەم نازانم، ئەوکات زۆر ئاسودە و دڵخۆش بووم، چونکە دواجار بووم بە خاوەنی برایەکی بچوك. تاوێکی باش گریام، باوکیشم هەر لە ئامێزی گرتبووم و دەستی بە سەرمدا هێنا تا ئارام بوومەوە.

دواجار بەئۆتۆمۆبێل چوین بۆ نەخۆشخانە، لە رێگای خۆماندا پورە هێلینمان گەیاندە شار، ئەو نەدەهات بۆ نەخۆشخانە، چونکە تەنها ئەندامانی خێزان بۆیان هەبوو مناڵ و دایکەکەی ببینن.

سەرەتا نۆرەی من بوو، لە دایکم نزیك بوومەوە، لە ئامێزی گرتم، بەڵام سەرنجمدا زۆر رەنگزەرد و لاوازبوو. برا بچوکەشم لەناو بێشکەیەکی بچوك دانرابوو، لە ژوورێکی فراوان بوو کۆمەڵێ مناڵی دیکەشی لێبوو، هەموویان تازە لە دایکبوبوون. کاتێك برا بچوکەکەمم بینی دووچاری جۆرێك لە بێ ئومێدی بووم، زۆر لەوە بچوکتر بوو کە پێشبینم دەکرد، روخساریشی زۆر سورتر بوو لەوەی چاوەڕێم دەکرد، لە خەوێکی قوڵدا بوو. پاشان شتێکی سەیر روویدا، براکەم وردە وردە بەخەبەر دەهات، پەنجە وردەکانی دەجولاند و بلاوی دەکردنەوە، ئینجا دەستی خستە دەمی و مژی. هێشتا نەیدەتوانی قسە بکات، رەنگە نەشتوانێ بیر بکاتەوە، بەڵام حەپەساو دیاربوو. بێگومان دەبێ لەم



جیهانە تازەیەی کە ماوەیەکی کەم پێی گەیشتووە، بحەپەسێ. دەستی درێژ دەکرد و لە هەوادا دەیجولاند، وەکو ئەوەی بیەوێ شتێ بگرێ، یا رەنگە ویستبێتی شتێکم پێ بڵێ. من ئێستا دوایین وشەم لە بیرە کە میکا پێی وتم، منیش بە براکەمم وت، وتم: "لە دایکبوونێکی شاد براکەم، جیهان هەمووی لە چاوەڕوانیت دان".

دوای چەند رۆژێك دایکم گەڕایەوە بۆ ماڵ، برا بچوکەکەشی لەگەڵ بوو، من ئەوکات تابلۆیەکی جوانم ئامادە دەکرد، لە تابلۆکەدا وێنەی زەوی بوو وەکو ئەوەی لە بۆشاییەوە تەماشای بکەی. لەسەریشیم نووسی: "سلاو.... کەس لێرەیە؟".

برا بچوکەکەم دوای چەندین رۆژ و هەفتە لە دایکبوونی هەر سەرسامی دەکردم. هەندێجار بەجۆرێك هاواری دەکرد من پەنجەم دەنایە گوێم، هەر دایکم لێی نزیك ببوایەتەوە دەستبەجێ ئارام دەبۆوە، ئەگەریش شیری پێ بدایە بەیەکجاری لە گریان کپ دەبوو، بەڵام من و باوکم لە هێورکردنەوەی دەستەوەستان بووین.

ئەو رۆژانە من سەرقاڵ بووم، بەڵام هەر بەردەوامبووم لەگەڕان بەدوای کەروێشکە سپیەکەمدا، راستە چیتر پێویستم پێی نەبوو، چونکە برایەکی راستەقینەم هەبوو، بەڵام هەستی حەزم دەکرد بزانم چی بەسەرهاتووە.

برێ جاریش بەدوای میکادا دەگەڕام، تائێستاش بەدوایدا دەگەڕێم، هەر جارێك لەسەر ئەو بەردەی بەسەر کەنداوەکەدا دەڕوانی، دادەنیشم یا سەرکەومە سەر تەپۆلکەکەی لای بەردە کۆنەکە، بیر لەو قسانە دەکەمە لە نێوان من و ئەو مامبۆیەی لە هەسارەی ئیلیۆوە هاتبووە، روویدا.

شتێکی تر هەیە دەمەوێ لەبارەیەوە بدوێم کامێلا، لە باسکردنیشی کەمێ شەرم دەکەم، بەڵام هەر بۆت باس دەکەم ئەگەر شەرم هێنەریش بێت. لەبارەی میکاوە هیچم بەدایکم و باوکم نەوت، بەڵام پێم وتن کاتێ دایکم لە نەخۆشخانە بوو هەندێ وێنەی دانسقەم گرتوە و کامێراکەشم دا بە باوکم تا ئەو وێنانە بشواتەوە. هەرگیز پێشبینی ئەو شتەم نەدەکرد کە روویدا، کامێلا بیهێنە پێش چاوی خۆت، کامێراکە خاڵی بوو، فیلمی تیا نەبوو!.

رێککەوتین لەسەر ئەوەی برا بچوکەکەم ناو بنێین مایکل، دایکم و باوکم پێیان وابوو "چو و مایکل" دوو ناوی رێکن. بە بیرم نایە چۆن لەسەر ئەو ناوە رێککەوتین، رەنگە من دەستم هەبووبێ لە هەڵبژاردنی ئەو ناوە، دەشێ بەر لە دایکبوونی مناڵەکە دایکم و باوکم لەسەر ئەو ناوە رێککەوتبن. بەڵام دڵنیانەبوون لەوەی مناڵەکە کوڕ دەبێت، تەنها من لەو شتە دڵنیابووم. کامێلا ئەمرۆ ژیان گۆڕاوە وەکو ئەو کاتەی من مناڵبووم، ئێستا لە نەخۆشخانەی تیشکی سەروودەنگی هەیە و پێمان دەڵێ کۆرپەکە کوڕە یا کچ، کەچی هێشتا مناڵەکە لە سکی دایکیەتی.

ئێستا کامێلا، پێم وایە تۆ دەپرسی: "ئایا بەراستی میکات بینی؟، یا شتەکان تەنها خەونێك بوون".

من بۆ ئەو پرسیارەی تۆ دەچەمێمەوە تا سەرم دەگاتە سەر زەوی، من خۆم زۆرم ئەو پرسیارە کردوە، کاتێك دوو کەس سەریان بەرز دەکەنەوە، بەرزتر لە دۆڵەکانیان و لەسەر ترۆپکی کێوێك بەیەکتر دەگەن، ناوی کێوەکە گرنگ نییە، ئەوەشیان بەلاوە گرنگە لەکوێوە هاتوون، چونکە کاتێك لەسەر لوتکەی چیایەك دەوەستین، وا هەست دەکەین لەسەر ترۆپکی جیهان وەستاوین.

لەو شەوەی کە برا بچوکەکەم تیا لەدایکبوو، من لەسەر لوتکەی جیهان بووم. کامێلا پێشم وایە زۆرێك لە دیدارە گرنگەکان لە ژیانمان لە کاتی نوستنماندا روودەدەن.

هەندێ لەو خەونانەی کە دەیانبینین زۆر روونن و بەرجەستەن، بگرە زۆر راستەقینەترن لە ژیانی راستەقینەی خۆمان کە لە خوارەوەی دۆڵەکە تیایدا دەژین. دوای ئەوەی چاوم بە میکا کەوت ویستم ببم بە کەشتیوانی بۆشایی، هەر واشم کرد. هەر کاتێك لە ئاسمان رادەمێنم، وام بە بیردا دێ کە بەدوای میکادا دەگەڕێم.

ئا ئەمەبوو چیرۆکەکەم کامێلا گیان کە پەیمانم پێدابووی بۆت بگێڕمەوە، کاتی پشووی نیوەی وەرزی خوێندن ویستم ئەم چیرۆکەی میکات بۆ بگێڕمەوە، چونکە خەریکبوو برا یا خوشکێکی بچوکت دەبوو، تا ئامادەی پێشوازیکردنی بی. هەوڵمدا لە گێڕانەوەی رووداوەکان ورد بم، بێگومان هەندێکم لە بیر چون، هەندێکی دیکەیشم بۆ



زیادکردوون، بەڵام ئەم شتانە هەمیشە کاتێك روودەدەن کە رووداوەکان زۆر دەمێك بێ روویاندابێ. پێم وایە شەو زۆر شتمان لەبیر دەچێ کە رۆژەکەی روویینداوە، بەڵام لەکاتی خەوتنیشدا ئەقڵمان لە ئیشکردن ناوەستێ: ئا ئەو کاتەیە کە دەچینە جیهانی خەوێکی قوڵەوە، وەکو ئەوەی لەدەرەوەی ئەم جیهانە بخزین بۆ جیهانێکی تری جیاواز.

دەشێ بۆیە لە شەودا خەون ببینین، چونکە ئەقڵمان هەوڵدەدا ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە لەکاتی خەودا دروست دەبێ و رووداوەکانی رۆژمان لە بیر دەچێتەوە، پاشان بەیانی دێت، هەموو ئەو شتانە وون دەبن کە خەومان پێوە بینیون، هەروەك لەگەڵ تشکی خۆر هەموو تنۆکە شەونمەکان لەناو دەچن.

دەشێ ئەگەر بەدرێژایی رۆژ سەرقاڵی ئەو رووداوانە ببین کە بەسەرماندا هاتوون، ئەوە لەسەرماندا هیچ شوێنێك نامێنێتەوە بۆ خەون. هەروەها ئەستەمە خەونەکانمان بە بیر بێتەوە، ئەستەم وەکو ئەوەی بمانەوێ باڵندەیەك بە دەست بگرین.

بەڵام هەندێجار بە یادمان دێنەوە، هەروەك ئەوەی هەندێجار باڵندەیەك بەرەو رووت دێ و بەوپەڕی ئازادی و ویستی خۆیەوە لەسەر شانت دەنیشێتەوە.

**لەگەڵ خۆشەویستیی مامت**

**چو**